


شيعر






٦٢٤/ يەنايير

**دانـــەر**

یاسین عەبدو للەتیف موحەممەد نۆغەرانی
پێشەوای مزگەوتی مەلا عابید لە پارێزگای هەولێر

١٩٨٤ز – ١٤٠٤ك

چاپی یەکەم



چاپخانەی نەورەس – سلێمانی ت ٢٢٥٥٢٣

شیعر




٦٢٤/ یەنایر

**دانـــەر**

یاسین عەبدوللەتیف موحەممەد نۆغەرانی
پێشەوای مزگەوتی مەلا عابید لە پارێزگای هەولێر

**چاپی یەکەم**



چاپخانەی نەورەس/ سلێمانی ت ٢٢٥٥٢٣

# به ناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

## ولقد نصركم الله ببدر وأنتم أذلة

الآية ( ١ )　　　　صدق الله العظيم

( ١ ) ئایەتی ژمارە/١٢٣ سورەی ئالی عیمران

سەرەتایەکی کورت :

پێشەکی ئەکەم سوپاسی یەزدان
داواش لەم ئەکەم بۆ یارمەتیدان

پڕ بە دڵ ئەڵێم ئەی خوای میهرەبان
دورودێکی زۆر وەك پشکە باران

دارژێنە بەتاو لای خۆت بێ ووچان
بە بەردەوامی تا دوایی جیهان

بۆ سەر سەروەری ئەجیندەو ئینسان
چاکترینی خەڵکی زەمین و ئاسمان

چرای ئایین و کۆڵەگەی دینمان
ڕۆناکی چاو و نوری ئیمانمان

فێنکی دڵمان و گلێنەی چاومان
(د·خ)
فەخری عالەم و سەروەری پیرۆزمان

یەکە بــژاردەی هاشــمی و قورەیشــیان
پێشەوامــــان و ڕێی پیشاندەرمـــان

باوڕی و ئیمـــان و هـــەردو شـــادەمان
هینا بێگومـــان بە تـــۆو بـــە ئەومـــان

خۆشەویســـتی تـــۆو خۆشەویســـتمان
(د٠خ)
( محمد ) نـــاوە لــــە نـــەوەی عەدنـــان

(د٠خ)
سێسەتو (١) سێنزە پەیغەمبـــەر ناویان
لە نێو ناوی ئـــەم نـــوسراوە لـــە ئاســـمان

بـــاوکی عەبـــدوللا دایـــکی ئامینــــە خان
دانیشتوی مــــەککە شـــاری کابەمـــان

لە ســـاڵی عاموالفیـــل هاتویتـــە جیهان(٢)
(د٠خ)
لە چلی‌شـــــا ناردرا بـــــە پەیغەمبەرمــــان

بەهۆی جوبرائیل لـــە ئاسمان لای یـــەزدان
قورئانی بـــۆ هات لە مانـــگی ڕەمـــەزان

---

(١) بەهەرژماری : پیتەکانی ئەبجەد ٠

(٢) لە بەرەبەیانی ڕۆژی دوشەمەی دوانزەی مانگی ڕەبیعی یەکەم لە دایك بوو لە شاری مەکە کـە لە ماڵی ئەبوتالبی مامی ئەبولەهەبی مـامیشی سوەیبەی ئازادکرد لە مزگێنی ٠

لە پەنجاو یەك و نۆ مانگ چوە ئاسمان (١)
جەنگی بەدزی کرد لە حەڤدەی ڕەمەزان

بە تاقە سواریش بە ئەمری یەزدان
توانی بە ماوەی بیستو سێ سالآن

ئایینی ئیسلام لەسەر ڕوی جیهان
بەلآو کاتەوە بە بیست و حەوت جەنگان

لێش ئەدەم دورودی خوای دەسەلآتدار
(د٠خ)
لەسەر منالّی سەییدی سەردار

بە زۆریش دورودی لێ ئەدەم بێ ژمار
(د٠خ)
لەسەر هاوڕانی سەییدی موختار

بە هەزارانیش سلآوی یەزدان
لە گیانی پاکی گەلی شەهیدان

لە شوهەدای ئیسلام مەردانی مەیدان
کە خەباتیان کرد بۆ ڕەزای یەزدان

نەش مردوون لەگیان زیندوون لای یەزدان(٢)
گشتیان نێژراوون لە باغی جینان

لە دوای ناو بردنو سوپاسی یەزدان
(د٠خ)
دورودیش لەسەر نێردراوی یەزدان

---

(١) بڕوانە ئایەتی ژمارە ١٦٩ لە سورەی ئالی عیمران ٠ (ح)

(٢) لە ڕێككەوتوی شەوی دوشەمی بیستو حەوتی مانگی ڕەجەب بوو لە سالّی هەشتەمینی پەیغەمبەراتی بوو (د٠خ) ٠ (ا)

ئەڵێن بەندەی هەژاری لەتیف
یاسینی کوڕی عەبدوللەتیف

گوندی نۆغەران(١) دانیشتوی هەولێر
گەڕەکی ڕزگاری شەقامی مەخمور

پێشەوای مزگەوتی مەلا عابیدی
شافعی مەزهەب و تەریقی نەخشبەندی(١)

ئەم جەنگی بەدرم لەبەر پڕ سودی
لە عەرەبییەوەم بە زوبانی کوردی

دوبارە کرد و پێشکەشیشم کرد
بۆ گەلی برایان لە ئیسلامی کورد

تکاکاریشم پڕ بە دڵ لە خوا
لە من و لە گەلی ئیسلامی برا

خۆشبی و ببوری لە گشتمان تێکڕا
ڕزگارمان کاتەوە لە ڕۆژی حەشرا

(د٠خ)
لە ژێر سێبەری ئالای محمد
لە دۆزەخی‌شا نەمان کاتن بەند

---

(١) شێوێنی لەدایك بوونی دێی جدیدەی زابە لە ناوچەی خەبات پارێزگای هەولێر مەشورەتی نۆغەرانە چونکە جێی باوکو باپیرانێتی وە زۆریی لەوێ ژیاوە ٠

(٢) ناوبراو وە لای شێخ محمد بەهاؤالدینی مەشهور بە شاهی نەخش بەندە خوالێخۆشبوو ، گۆڤاری عەرەبی ژمارە ١٤٦/ینایر حوکومەتی کویەت بەڵاوی کردبۆوە لە مێژووی ١٩٧١ ٠

(د٠خ)

به تێکڕایی‌شمان لـه دوای خۆشـەویست
بۆ بەهەشتمان بات نەمـان‌کات پێـویست

## ( باسی چۆنیەتی بەدر )

بــەدر دێی‌یــەکە نزیــك مەدینـــە
کەوتویتـە نێـوان مـەککەو مەدینـــە

به نـاوی پیاوێـك هـەردراوه بـەدر(۱)
کـوڕی موخەللـەد ئـەویش کـوڕی نەضر

کـــوڕی کینانـــه دانێشـــتوی بـــەدر
یان بـەس به نـــاوی بـــیرێی‌کا بـــەدر

(د٠خ)

کـاتی نەزانـین پێش هـاتنی پەیغـەمبەر
سـاڵێ هـەشت ڕۆژان عـەرەب له بـەدر

کۆ ئەبونـــەوه بـــۆ بازرینـــــگانی
دواییش ئەمـــاوه بـــه چۆڵـــەوانی

بـۆ کاروانچیـانیش کاروان سـەرابوو
بۆ مەککه و مەدینـەش ڕێگای شامیان بوو

## ( باسی چۆنیەتی مێژوی بەدر )

مێـژوی ڕوداوی ئـەم جەنـگەی بـەدر(۲)

(د٠خ)

له دوەمین ســـاڵی کـــۆچی پەیغەمبـــەر

---

(۱) بڕوانه قصستەلانی بەرگی/۸/لاپەڕە/۵ ٠

(۲) بڕوانه پەرتوکەانی نورالیەقین‌و محمد ڕەزا ٠

لە ڕۆژی حەڤـدەی مانـگی ڕەمـەزان (١)
ڕوی‌دا لە نێـوان ئیسـلام و کافـران

پێشەکی جەنگی‌یش بـە کاری یـەزدان
ئەمەبـوو کـاروانی قوڕەیشـیەکان

چووبوو بـۆ وولاتی شام بـۆ بازرینـگان
ژمارەی چل‌سواربوو(٢)لەگەڵ ئەبی‌سەفیان

لە کاتی چـوونی کاروانیش بـۆ شـام
(د٠خ)
پێ ئـاگادار بـوو پەیغەمبـەر بـەڵام

پێرانـەگەیشت بچێتـە بـەرایی‌یان
چاوەڕوانیـان بـوو لـە هاتنەوەیـان

بەرایی‌یان لێ بگـرێت لـە کانی بـەدر
بۆ ماڵ و سـامان یان بـەس بۆ نەفـەر

لەگـەڵ کـە بیستـی گـەڕاوە کاروان
لە هـاوڕانی خۆی کـردە تـان لێدان

داوای کـرد ووتی کاروانی قوڕەیشـیان
ئـەوا گـەڕاوە بچۆنـە پێشـیان

---

(١) لە بەرەبەیانی ڕۆژی هەینی بـوو بڕوانـە تەفسیر خازین ، بـەرگی /٢/ لاپەڕە/١٨٢ ٠

(٢) عەمری کوڕی عاس‌و مەخرەمەی کوڕی نەوفەڵ‌و زوهرەش لەگەڵ کاروانەکە بوون بارەکانی‌شیان عەترو ئاوریشم بوو ٠ بڕوانە تەفسیری خازین بەرگی/٢/لاپەڕە/١٧٧ ٠

لــــه خـــوام تكايـــه گه‌مارۆيـــان ده‌ن
وه‌لاميـــان داوه زۆريـــان بۆ فه‌رمـــان

لاشيان گران بــوو هه‌نــدێی دواكه‌وتــوو
چونكه لای خۆيـان گومانيـــان وابـــوو

(د٠خ)

په‌يغه‌مبه‌ر لــه‌م هه‌لــه نايه‌وێی تــن جه‌نگ
چونكه كۆنگــره‌ی نه‌به‌ستبوو بــۆ جه‌نگ

به‌ڵكه‌م پێی ووتبــوون هــه‌ركه‌س ووڵاخی
حازره له‌گه‌ڵمــان با ســواربێت له ووڵاخی

بۆ ئه‌م كه‌سه‌شـــا چـــاوه‌ڕوان نه‌بـــوه
كه خــۆی حــازر بــوه ووڵاخی بــزر بــوه

زرێــی فــزولی(١) لــه بــه‌ره خــۆ كــرد
حه‌مايلی شــيری عــه‌ربی(٢) له مــل كــرد

عه‌بدوالالای مه‌كتومی ڕه‌زای خوای له سه‌ر
له ســه‌ر مه‌دينـــه دانـــا بـــه جێگـــر

له دوای سێ شــه‌وان له مانــگی ڕه‌مــه‌زان
ده‌رچــوو بــۆ بــه‌در و بــه‌رايی كـــاروان

**(باسی چۆنیه‌تی هێزو سوپای موسوڵمان له جه‌نگی به‌در)**

له‌م كاتا په‌يغه‌مبه‌ر دورودی خــوای له سه‌ر(٣)
بۆ به‌در ده‌رچـــوو بــه خـــو به عه‌ســـــكه‌ر

---

(١) فضولی
(٢) عضب ٠
(٣) بڕوانه په‌رتوكی نوراليه‌قين/لاپه‌ڕه/١٠٧ ٠

سێ سەت و سێنزە پیاوی لەگەڵ بوو
مەسعەبی عومەیری ئاڵا هەڵگر بوو

دو سەت و چلیان لە ئەنساریان بوون
ئەمانەی تریشیان لە موهاجیران بوون

حەوتا ووشتر و دو ئەسپیان پێ بوو
بەڵام سواریشیان دوپشتەکی بوو

ئەبی سەفیانیش(١) وەکی پێی زانی
(د•خ)
پەیغەمبەر چویتە بەرایی کاروانی

زەمزەمی(٢) کوڕی عەمری غەففاری
بە کرێی(٣) گرت بۆ مەککە ببات هاواری

بە سواری بچێت بۆ لای قوڕەیشیان
پێیان بڵێتن بگەنە کاروانیان

زەمزەمیش لەم کاتا بۆ مەککە چوو بوو
کراسی دڕان بوو ووشتری لوت بڕی بوو

لە نێو قوڕەیشیان هەیهاوی کردبوو
باس و سۆراخی کاروان چی هەبوو

هەمووی بەم شێوە بە قسەی ئەبی سەفیان
پێ ڕاگەیاندن ووتی ئەی گەلی قوڕەیشیان

---

(١) کوڕی سەخری کوڕی حەربی کوڕی ؤمەیەیەی کوڕی عەبدی شەمسی کوڕی عەبدولمەنافی قورەشی ئەمەویە • بڕوانە پەرتوکی ؤسدوالغابە فی مەعریفەتی السەحابە بەرگی/٤ •

(٢) ضەمضەم •

(٣) بە بیست میسقال پارە ، محمد ڕەزا •

بگەنە سامانتان لای ئەبی سەفیان
(د.خ)
محمد چویتە بەرایی کاروان

قورەیشیش وەك زانیان سۆراخی کاروان
گەرمیان گەیشتێ بە زۆریش ترسان

لە حەژمەت زیانی زەلام و سامان
بوە موشەووەشیان تێکدا قژقژان

وابوو لەم کاتیش ئەبو جەهلیان
داوای لە خەلك کرد جارو عامیان

هەموو لە هەموو بە تێکڕایی‌یان
بە هاوار بچنە بەرایی کاروانیان

گشت ئامادە بوون سوار و پیادەیان
بەبێ دواکەوتووش لە ئەشرافیان

بەس لەمان نەچوو ئەبی لەهەبیان
عاسی هیشامی ڕەوان کرد لەگەڵیان

ئومەیەیەی خەلەفیش(١) ویستی دەرنەچێت
بمێنێت لە مەککە لەگەڵیان نەچێت

ئەمەش هەلبەتە لەبەر قسێك بوو
سەعدی مەعازی بە ئومەیەیەی ووتبوو

کورتەی ڕوداوی قسەکەش ئەمە بوو
سەعدو ئومەیەیە نێوانیان وابوو

---

(١) بڕوانە پەرتوکەکانی نوڕالیەقینو قەستەلانی . ج/٨/لاپەڕە/٤ .

بەر لە بەدرەوە دۆستاتیان هەبوو
هەرچەند جار ئومەیەیە بۆ شامێ دەچوو

دەچوە مەدینە مێوانی سەعد دەبوو
سەعدیش هەرچەند جار بۆ عەمرە دەچوو

لە مەکەکە مێوانی ئومەیەیە دەبوو
وابوو تا جارێ بۆ عەمرە چوو بوو

لەوێش مێوانی ئومەیەیەی ببوو
لە ترسی قورەیشیان یەکجار پەرۆش بوو

بە ناچاریەوە بەر لە نیوەڕۆ
ئومەیەیەی بۆ بەیتێ لەگەڵ خۆ بردبوو

لە ڕێیش ئەبوجەهلی(١) پیسیان توش ببوو
قسەی نا تەرزی بە سەعد(٢) ووتبوو

پێی ووتبوو چما ئایە ئەمن تۆ
نابینم لە مەکەکەی بە هێمنی و لەسەرخۆ

ئەسوڕێی‌تەوە کە هەر ئێوەشن
بە تێکڕایی‌تان دەرچوون لە ئایین

گومانتان وابوو بە یارمەتی‌تان
سەرکەوتوو بکەن مەدینەیی‌یان

---

(١) ناوی عەمری کوڕی هیشام کوڕی عەبدولموتەلیب بوو لەنەوەی قورەیشیان بوو ئامۆزای پەیغەمبەر بوو (د٠خ) ٠

(٢) کوڕی مەغازی ئەوسی ئەنسار بوو لە دانیشتووانی شاری مەدینە بوو ٠

بـــەڵام وەالاهی ئێســـــتاش ئەگـــەر تۆ
لەگـەڵ ئومەیەیـــەی نەبـــوایە ئەتـــۆ

نەدەچویتـــــەوە بـــە هێمنی و خـــۆشی
بۆ نێــــو منــــاڵت بـــە فەرامـــۆشی

سەعدیش لــە وەڵام بـــە دەنگ بـــەرزیەوە
جونو قســــەکەی بە ئەبوجەهــــل ووتبۆوە

ووتبـــوی وەالاهی گەر لە بـــەیتێ تــۆ
قەدەغەم بـکەیت ئـــەمنیش ئـەبێ تــۆ

قەدەغــە بـــکەم لەم شـــتەی لـــە لای تـــۆ
پێویســــــتی ترە لــــە بەیتـــا بۆ تـــۆ

شتەکــــەش ئەمەیــــە ڕێی مەدینەتـــە
ڕێی هات و چـوونی شـــام و مەکەتـــە

ئومەیەیەش بە ســەعدی ووتبوو ئـەی سەعد
لای ئەبوالحـەکەم(١) بـۆچ دەنگت بـەرز کرد

ئەم مەزن و گـــەورەی شـــاری مەکەکەیــە
جا وابوو سەعدیش قســـەکەی لەم ڕکەیـــە

بە ئومەیەیە ووتبـــوو وەالاهی من خـــۆم
(د٠خ)
لــە ڕەســـــولی خوا ئـــاوا بیســـــتیتم

لە مەکەکــە ئـــەوان ئەتـــۆ دەکـــوژن
ئومەیەیەش ووتی لــــە مەکەکەم دەکـــوژن

(١) ئەبوجەهلی کوڕی هیشامە ٠

له دوایی‌یا ســـــەعدیش بە تونــــدی ووتی
ئەمن نــازانم ئومەیـــەیەش تــــرس گرتی

گەڕاو مـــاڵێ چـــوو بە ژنـــەکەی ووت
ئەی دایکی ســـەفوان ئایە تۆ نــەت‌دیت

سەعد چ قســێکی تـــازە بــــە من ووت
ژنـــەکەش ووتی چ قســەی بە تـــۆ ووت

ووتی گومـــــانی وا ئەبـــات ســـەعد
له مەکەکەم بکــوژن بە قســـەی محمـــد (د٠خ)

ئومەیەیە ســــوندی خوارد لای ژنـــەکەی
ووتی وەالاهی دەرناچـــم لــــە مـــەکەکەی

وەك کاتی بـــەدریش داهـــات وەك ووتمـــان
ئەبوجەهل داوای‌کرد لە گشت دانیشتووان(١)

تێکڕیان بچنـــە هـــاواری کاروانیـــان
ئومەیەیـــەش ویســـتبووی نــەچێت لەگەڵیان

ئەبو جەهل پێی ووتبوو ئەی بــاوکی سەفوان
بۆ هـــەر کارێکا گــــەلی دانیشــــتووان

تۆ ببی‌نن نـــەچیت ئـــەوانیش نـــاچن
بەڵام گەر تــــۆ چـــویت تێکڕایـــان دەچن

بەم جۆرە ئەبو جەهـــل خەریـــکی ببـــوو
بە درۆو فــڕوفێڵ لــــە خشتەی بردبـــوو

(١) دانیشتووانی شاری مەکەکەی پیرۆز .

تا ئـەویش ئامادە ببـوو لەگەڵیـان
بەس چوونی ئـەمو چـوونی گشـتیان

بۆ خـاکی بـەدر و هـاواری کاروان
بە خۆشی خۆیـان نەبـوو بێگومـان

کاری یـەزدان بـوو ئاوا بێهـۆش بان
بۆ چارەنووسیان هـەر ئەبـا بچویـان

## (باسی(١) چۆنیەتی هێزو سوپای)
## (قورەیشیە گاورەکان(٢) لە جەنگی بەدر)

ژمـارەی دوژمن لـە هاوبەشـیەکان
نۆسەت و پەنجا بـوون بە ژنو پیـاوەکان

حەوسەت ووشتر و سەت ئەسپیان پێبوو
شەش سـەت زرێی پۆلاییشیان پێبوو

پێنجسەتیان لای سوار ووشترو پیادەبوو
سەتیشیان لە دەست سوار ئەسپەکان بوو

ئالاّ هەڵگریشـیان سـائیبی یەزیـد بوو
ئەم پێنجـەم بابای ئیمـامی شـافیعی بوو

خواردن و ئازوخەی ئـەم سوپاو هێـزەش
دوانزە کەس ئەیاندا لە نـەوەی قورەیش

---

(١) بڕوانە پەرتوکەکانی محمد رەزاو نورالیەقین/لاپەڕە/١٠٨ .

(٢) بێگومان قـورەیشی دوانـزە بەرەباب بوینـە لە مەککەی پـیرۆز ئیسلامو گاووریان هەبوە ئیسـلامەکان پەیغەمبەرو (د٠خ) خێزانانو منـالانو گەلی هاوڕانی ئـەم بون ، گـاوورەکانیش ئەبوجـەهلو هەر حـەوت مامەکانی پەیغەمبەرو چەند کەسێکیتر بوون لەوان .

هەر یەکە لەمـــان ڕۆژێی ســـەت ووشتری
لە ووشتری خـۆیا بۆ ســـوپا سەرئـــەبڕی

هەر دوانزەکانیش ئـــەم ناوانە بـــوون
ئەبوالبوختەری و (١) ئەبو جەهلی مەلعون

حـــەکیمی حیـــزام و ئوبەیەیـــەی خەلـــەف
زومعەی ئەســـوەدی و ئومەیەیـــەی خەلەف

دو کوڕی ڕەبیعـــە عوتبـــە و شەیبـــە
هەردو کوڕی حەجاجی یش نەبیە و مونبە

یانزەمین نـــەزری (٢) کـــوڕی حـــاریث بوو
دوانزەهەمی شـــیان ئیمامی عەبابـــاس بوو

## (باسی دەرچوونی سوپاو هێزی قوڕەیشیە گاورەکان)
## (لە مەکەکە بۆ خاکی بەدرو هاواری کاروان)

شێوەی دەرچوونی قوڕەیشیە(٣) گاورەکان
لە مـــەکەکەی پـــیرۆز بـــەرەو لای کـــاروان

ئەوهابـــوو پیـــاوەکان بەخـــۆ بـــە چـــەکان
بە هـــەرو گیف و بـــە دڵ پەشـــۆکان

بەڕێز لە ڕێـــگا لـــە دوای ئافرەتـــان
ئەڕۆیین واشـــبوو ڕێـــزی ئافرەتـــان

بە سەماو هەڵهەڵـــەو بە بـــەزمو سەیران
بە سرودو گـــۆرانی لە دژی ئیســـلامان

---

(١) ناوی عاسی کوڕی هیشامی کوڕی موغەیەیەو قوڕەیشی ئەسدی بوو ، ئەمەی موجزیری کوڕی زیاد کوشتی ، بڕوانە پەرتوکی ئوسدوالغابە بەرگی/١ ٠

(٢) نضر ٠

(٣) خزمو گەلی قوڕەیشیە ئیسلامەکان بوون ٠

بەخـــانو مـــانی‌یش ڕازاو وەك بـــوکان
لە ڕێی ئەڕۆیـــین لە پێش پیـــاوەکان

ئەمـەش بێ‌گومان شـــەیتانی مەلعـــون
ئەم کردەوانـەی لەلا جـوان کردبوون(١)

بۆ هاوکاریان تیـــخ تیخەی دابـــوون
یەکە بە یـەکەش ئـــاوا پێی ووتبـوون

کەس نیـە ئیمڕۆکە لە خەڵك لـە سەرتان
بـالآبیت ئەمنیش خـۆم دەهێـم لەگەڵتان

بەم شـێوە شـــەیتان(٢) ڕاپێچـەکی دان
گشتی دادوەخـــۆ بـــە هەڵـــەداوان

وابوو لە نزیـك جـەنگ وەك هـەردولاش
لێك بە دیار کەوتن شـەیتان پاشەو پاش

کشـاوە دواوە دابـــڕا لــە وولـــداش
کلکـە دۆڵی کـــرد بێ تەماشـــای پـاش

حەرسی هیشام ووتی بۆچ ناهێت لەگەڵمان
شـەیتانیش ووتی مـن بەریی‌مـە لێتـان

ئەم شـتەی من بـە چاو ئەبینـم کەسـتان
لە ئێوە نـــای‌بی‌نن بـــە چاوی خۆتـــان

---

(١) بڕوانە ئایەتی ژمارە چل‌و هەشت لە سورەی ئەنفال/٤٨ ٠

(٢) خۆی هێنابوە سـەر وێنەی سوراقەی کـوڕی مالیکی کـوڕی جەعشەمی ،
بڕوانە تەفسیری خازین بەرگی/٣/لاپەڕە/١٩٩ ٠

شــتەکەش ئەمەیـــــە فریشـــــتەکانن
لە ئاســمان دهێنە خوارهـــا ئەمەتـــانن

مەترسیش ئـەکەم ئـــەمن لە یـــەزدان
بەهێــز و تووانایە ئـــەم بۆ ســـەزادان

جــگە لەمەشـــا وەك لــــە پێش ووتمـــان :
(د٠خ)
ئەبی‌سەفیان وەك زانی نێــردراوی یەزدان

بە خۆ بە هــاوڕان چویتــە بــەرایی‌یان(١)
ترسا سوارێــکی هەنـــارد بە غـــاردان

بۆ مەکەکە هــاوار ببات بــۆ قــورەیشیان
هــۆی زانینیشی ئەمــە بوو ئــەبی سەفیان

وەك لە شــام دەرچوو بــە خۆو بــە کاروان
بەرەو لای مەکەکـــە کەوتە ڕێی و بـــان

دو زەلامی دیت دور بـــــە دوریـــــــان
وەك ئەوانیـــان دیت گەڕانـــەوە دوایان

لەمە هەستی کرد کـــە سوپای ئیســـــلام
چوویتــە بەرایی‌یـــان زۆر ترسا بـــەڵام

لــــەم ڕێــــگای لادا پێـــــدا ئەڕۆیشت
کەناری دەریای گرت قوتـــار بوو ڕۆیشت

---

(١) بڕوانە پەرتوکی نورِوالیەقین/لاپەڕە/١٠٨ ٠

## (باسی چۆنیەتی پەیابوونی ناکۆکی لەنێوان ئەبوجەهل و)
## (ئەبی سەفیان لە کەناری دەریا لە ڕێگای مەکەکە)

بۆ جاری دوەمیش هەمیسان ئەبی سەفیان
ڕابەرێ تـری نارد بـۆ لای قورەیشـیان

بـۆ ڕاگەیانـدنی هـەواڵی کاروان
پێشـیان بڵێن بچنـەوە دوایـان

ڕابەریش وەك چـوو لە ڕێی توشیان بـوو
بـاس و سـۆراخی کاروانچی هەبـوو

پێی ڕاگەیاندن بـە قسەی ئـەبی سەفیان
ووتی تێکـڕاتان بگەڕێنـەوە دواتـان

ئەبو جەهلی سـەگ لـە وەڵامی ڕابـەر
ووتی ناچینـەوە ئێمە تـا بـەدر

لـەوێش بـۆ سێ شت ئەمینێ‌نـەوە
ئەچین ووشـتران لێ‌ئەکوژینـەوە

چێشت و شـەڕابیش لێ‌ئەخۆینـەوە(١)
لەم کاتـا عـەرەبیش لای خۆیانـەوە

گوێمان لێ‌ئەگـرن پێ سەرسـام ئـەبن
لێمان ئەتـرسێن هەتـاکو مـابن

وەك ئەبو جەهلیش بە قسەی ئەبی سەفیان
نەگـەڕاوە دوا ژمارەێـك لە قورەیشـیان

---

(١) بروانە پەرتوکەکانی محمد ڕەزاو نورالیەقین/لاپەرە/١١٠ ٠

له تیرەی زوهـره نزیك سـەت کەسـیان
لەگەڵ ئەخنەسـا چونـەوە دوایـان

چونکە سـوند خـۆرو سەرکـردەیان بۆو
بۆ گشت کاریێکیان ئەم دەم ڕاستیان بوو

پێی ووتبوون ئەی تـیرەی زوهـره ئـاوا
سامانی ئێـوەی ڕزگار کـرد خـوا

بێ ئـازارو زیـان بە هێمنیـیەوە
قوتاریشی کـرد هـاوڕەکەی ئێـوە

مەخرەمەی کـوڕی نەوفەل بـۆ ئێـوە
بـە گـوێیی من بـکەن بگەڕێنـەوە

وابوو ئەوانیش بـە قسـەی ئەخنەسا(١)
گشت گەڕانـەوە کـەس دانەڕسـا

وەك ئەوانیش تیرەی(٢) عەدی کوڕی کەعب
بۆ دوا گـەڕاوە نەچوو بـۆ حـەرب

بـەم جـۆره هێز و سـوپای گـاوران
ڕۆیشت هەتـاکو بـەدر نەوەسـتان

له ڕوی مـەکەکەوە لـە زەوێی بـەرین
لـە ڕۆخـەی دۆڵی بـەدر دابـەزین

---

(١) کوڕی شورەیقی سـەقەفی بوو سـوندخۆری تیرەی زوهره بـوو ، بڕوانە پەرتوکی محمد ڕەزا/لاپەڕە/١٦٤ .

(٢) بڕوانە پەرتوکی نوروالیەقین /لاپەڕە/١١١ .

(د٠خ)

بـەڵام پەیغەمبـــەر ئاگادار نەبـــوو
کە قورەیشیەکان ئـەم کارەیان کـردبوو

**(باسی چونیەتی دەرچوونی هێزو سوپای)**
**(ئیسلام لە مەدینە بۆ خاکی بەدر)**

شێوەی دەرچوونی سـوپای ئیسـلامیش
لە مەدینەوە بـــۆ بــەدر ئـــەویش

(د٠خ)

ئەمە بوو پەیغەمبەر دورودی خوای لە سەر
لە مەدینـەوە دەرچـوو بەخۆ بـە عەسکەر

ڕۆیشت تـا چوە بیـوت والسـوقیاوە(١)
سوپـاکەی لـــەوێی گشت کۆکـــردەوە

لە بچـوك حـەوت کـەسی لێ جیـا کردەوە
نەیبــردن لەگەڵخـۆ ڕەوانی کردنــەوە

ناوی هر حەوتیش بـــەم شێوەیە بـــوو
یەکەم ئوسامەی کــوڕی زەیــد بــوو

دوەم ڕافیعی (٢) کــوڕی خـــەدیج بــوو
سێیەم بـــەڕڕائی کوڕی عـــازەب بوو

چوارەم ئوسەیدی کـوڕی حەزیـر(٣) بوو
پێنجەهــەم زەیـدی کـوڕی ئەرقـەم بـوو

---

(١) شوێنێ کە لە دەرەوەی نزیکی مەدینەیە لە ڕێگای بەدر ٠

(٢) لە تیرەکانی خەزرەجو ئەوس بوو ٠ (٣) حظیر ٠

شەشەمین زەیـــدی کوڕی ســـابیت بوو
حەوتەم عومـــەیری ئـــەبی وەقاقـــاس بـــوو

ژمارەیێ تـــریشی لـــە بێهێـــزو پیرەمێـــرد
لە ســـوپا دەرکـــرد لەگـــەڵ خـــۆی نەبـــرد

بە هەناســـەی ســـەرد ڕەوانی کردنـــەوە
گەڕانەوە مەدینـــە بـــە گریانـــەوە

(د٠خ)

لە بیوت والســـوقیاش پەیغەمبەری خـــوای
سەعیدی زەیدو تەلحـــەی عوبەیـــدوالالای

بەرەو لای شـــامێی بـــە جاســـوس ناردن
بـــۆ هێنانـــەوەی دەنـــگ و بـــاسی دوژمن

ئەمجا پەیغەمبـــەر دوورودی خوای لەســـەر
لە بیوت والســـوقیاش بە خـــۆ بە لەشـــکر

چوە ڕەوحایێ لـــە ڕەوحـــاش وابـــوو
باسی قوڕەیشـــیانی ئاوا بـــۆ هاتبـــوو

کە هەموو لـــە هەموویان بـــۆ یارمـــەتیدان
دەرچوینە بـــە هاوار بۆ بـــەرایی کـــاروان

هەر لـــە ڕەوحـــایێیش هـــەردو جاسوسی
گەڕانـــەوە لای گشت دەنـــگ و بـــاسی

کاروانیان بۆ هێنـــا ووتیان ســـبەییان
دو سبەی ئـــەگاتە بـــەدر کاروانیـــان

---

(٣) شوێنێکە سی یان چل میل دورە لەجنوبی ڕۆژئاوای شاری پەیغەمبەر (د٠خ)

## (باسی چۆنیەتی داواکردنی پەیغەمبەر د.خ)
## (لە پیاوە گەورەکانی سوپا بۆ بیروڕا دەربڕین لە خاکی ڕەوحاء

(د.خ)

بـۆ دوەمـین جـاریش پەیغەمبـەری خـوا
لە ڕەوحاش هـەر وەك بیـوت والسـوقیا

هەمیسـان سـوپاکەی لێـك کۆکـردەوە
گـەورانی سـوپای لێ جیاکـردەوە

ووتارێـکی دا (١) بـەم شـێوە دووا
ووتی ئەی خەڵـك بەر لـەم کاتا خـوا

بڵێنی دای مێی لـە بـەدر بـۆو ئەبێت
لە هـەردو لایـان لایەکـو ئـەبێت

ماڵ و سامانیان (٢) دەسکەوتـوو ئەبێت
یان لە جەنـگ ئێوە سـەرکەوتنو ئەبێت

(د.خ)

لـە دوای ووتـاریش وابـوو پەیغـەمبەر
چاك بـۆی ڕۆن بـۆوە هەندێی لـە لەشکر

ماڵ و سامانیان بـۆ خۆیان ئـەویست

(د.خ)

ئەوانیش وەك زانیان پەیغەمبەر تێگەیشت

---

(١) بڕوانە پەرتوکی نورو الیەقین/لاپەڕە/١٠٩ .

(٢) بڕوانە ئایەتی ژمارە حەوت/٧/ لە سورەی ئەنفال .

ووتیان ئـەی ئەتـۆ بۆچ پێشـەکی جەنگ
بە ئێمـەت نەووت تـا ئێمەش بـۆ جەنگ

خۆ ئامادەکـەین ئێسـتاش کە هاتـین
بەس تەنهـا ئێمە بـۆ سـامان هاتـووین

هەرواش پەیغەمبەر دوورودی خوای لەسەر
لەگـەڵ موهاجـیران دوا بـە دوای ووتـار

لێدوانێکی کـرد بـۆ دەربـڕینی
بیرو ڕای ئـەوان دەربـارەی زانیـنی

لەوانیش ئیمـامی ئەبوبەکـر و عومەر
بـە چـاکی دووان ڕەزای خوایان لـە سەر

## (باسی چۆنیەتی هۆی ڕوداوی ووتارەکەی پەیغەمبەر)
## (د٠خ لە خاکی ڕەوحاء لە نێو لەشکر)

(د٠خ)

هـۆی ڕوداوی ووتـاری پەیغەمبـەر
لە ڕەوحـا لە نێـو سـوپاوو لەشـکر

(د٠خ)

ئەمە بـوو پەیغەمبـەر لـە ئەنساریان
مەترسی هەبـوو نەزانـن لە سـەریان

**واجبە پارێـزی ئـەم بکەن لـە دوژمن**
نەك تەنـها لـە پڕ لـە مەدینـە دوژمن

گـەر دەورەی لێدا پارێـزی بـکەن
لەمە دوا هیچی تـر بەرگـری لێنەکەن

نەوەك نەشزانــن واجبـــە لە ســـەريان
لە دەرەوەی مەدينـــەش وەك نــاوە خۆيــان

(د٠خ)

گەر پەيغەمبەر گشتيان بباتە سەر دوژمن
لەم كاتەشــا ئەبێت هـــەر بیپارێـــزن

چونكە لـــە دوەم(١) : عەقەبــە ئەنســاری

(د٠خ)

پەيمانيان وابــوو بـــەس پەيغەمبـــەری

لە ناوە خۆيـــان بـــاسكەن لـــە دوژمن
وەك پـــارازتنی منـــاڵ و ژن لـــە دوژمن

پەيمـــانی عەقەبـــەی دوەميش وابـــوو
لە مێژوی ســاڵێك بـــەر لــە كۆچی بـــوو

لە پێش جەنگ لەســـەر واجب بونيش بوو
پەيمانەكەشـــيان بـــەم شـــێوەيە بوو

لە حەوتاو سێ پياوو(٢) دو ژن پێكهاتبوو
كۆڕی پەيمـــانيش لـــە مينـــایێ بـــوو

وابـــوو تێكڕاشـــيان ئەنســـاريەكان
حەوتـــاو سێ پياوو هـــەردو ژنـــەكان

لە تـــيرەكانی ئـــەوس و خـــەزرەج
گشت چوونە مـــەكەكە لـــە موسيمی حـــەج

---

(١) بڕوانە پەرتوكی نورواليەقين/لاپەڕە/٧٦ ٠

(٢) يەكيان نوسەيبـــەی كچی كەعب بوو لە بەرەمـــاڵی دارتاشان بـــوو ئەمەی تریشيان ئەسمائەی كچی عەمر بوو لە بەرەماڵی سەلەمە بوو ٠

موسوڵمانــەکان گشت بۆ حــەج چووبوون
گاووره‌کانیش بۆ ئیسلام بوون چووبوون

بە وەفــدو ســـەردان بــۆ لای پەیغەمبــەر
(د٠خ)
وەك گەیشتنە مەکەکە ووتیانــە پەیغەمبەر

بە شـــــەو دهێـنــــە لات بە نهێنیمــــان
بۆ کــۆڕی عەقەبە بــۆ پەیمــان بەستنمان

لەم کاتا پەیغەمبــەر درودی خوای لەســەر
ووتی ئێوە لە خەو کــەس مەکەن هەشیار

چــاوەڕووانیش مــەبن بۆ یەکێ بــزر بوو
ئــەم کارە نهێنیــەش بەهــۆی ئەمــە بوو

نەبادا قـــورەیشی ئـــاگادار بنـــــەوە
پەیمانەکەیــــان هەروەشیەننــــــەوە

ئەنساریەکانیش وەك لــە حــەج بونــەوە
لەگـــەڵ گاورەکان یەکو دو بـــە یەکەوە

بە نهێنیــــان لـــــە سێیەکی شـــــەو
چوونە عەقەبــە هــەر حەوتــاو سێ پیــاو

پێشــەکی پەیمـــانیش ئەنساریـــەکان
(د٠خ)
ووتیانە پەیغەمبـــەر تۆ وەرگـــرە لێمان

ئەم شتەی لات خۆشـــە بۆ تۆو بۆ خـــوا
(د٠خ)
لە وەلام پــێی ووتن خۆشــەویستی خــوا

ئەی کەم بــە مــەرج بۆ خــوای خــۆم ئەمن
خـــوا بپەرســـــتن تەنیـــاشی بـــزانن

بۆ خوا هیــچ شتیش نەکەن بــە هاوبەش
بۆ گیانی خۆشــم مەرجی‌شـــە ئەمـــەش

لە هـــەر کات ئـــەمن هاتـــم بۆ لاتـــان
قەدەغــەی دوژمنـــم لێ بــکەن تێکــڕاتان

لە دژی ئــەم شتەی ئێـــوە لای خۆتـــان
قەدەغـــە ئـــەکەن لـــە ژن و منالّتـــان

(د•خ)

پەیغەمبەریش لــەم کاتا لە کــۆڕی پەیمان
بەس عەباباسی لابوو لــە قورەیشــیەکان

ئەم لەســەر ئایینی گەلــەکەی خــۆی بوو
بۆ پەیمانەکەش بـــەلاّم کـــە چووبـــوو

بەهۆی ئەمـــە بوو ویســـتی ئامـــادەی

(د•خ)

کاری پەیغەمبـــەر ببی‌تـــن بە خـــۆی

بۆ دلّ نیابـــوون لـــە برازای خـــۆی
وەك کۆش‌بوونەوە وابــوو ئــەم بە خــۆی

بە قســەش پێی ووتن ئــەم برازایــەی من
لە نێو گەلی خــۆی پارێزی ئەکــرێ‌تن

کەس تووانای نــەبوە لــە گەلەکــەی ئەم
ئاژاوەو ناکــۆکی بکات لـــە دژی ئـــەم

له دواییش پێی ووتن گەر ڕاتان وایە
ئەم پەیمانەکەی بە ئەمتان دایە

بۆی بەجێ بگەیەنن و بشی پارێزن
لەم کەسەی ناکۆکی لەگەڵا ئەکاتن

ئەمە ئێوە و ئەم هەموو ئەرکەتان
ئەگینا لێ گەڕێن ئێوە تێکڕاتان

ئەم بمێنێ ئەوە لە نێو گەلەکەی
شوێنێ پیرۆزیان هەیە لە مەکەکەی

له وەڵامی عەباباسیش بەرپرائی مەعروریان
قسەی کرد دووا گەورەی ئەنساریان

ووتی وەالالاهی ئێمە گەر شتێکمان
له دڵ هەبایە بۆ نەفسی خۆمان

کە قسەی پێوە بکەین ئێستا ئەمانووت
بەڵام چی ئێمە بەس ئەومان ئەوێت

ڕاستی و پەیمانمان بەجێ بگەینین
(د•خ)
لەسەر پەیغەمبەر گیانمان بمرێینین

(د•خ)
له دوای کۆتایی ووتاری پەیغەمبەر
کە دووا لە ڕەوحا لە نێوان لەشکر

میقدادی کوڕی (١) ئەسوەدی کیندی
هەستاوە سەر پا بۆ ڕاو تەئییدی

---

(١) بڕوانە بەرتوکی نوروالیەقین/لاپەڕە/١٠٩ •

(د٠خ)

قسەی کرد ووتی ئەی ڕەسولی خوا
ئەتۆ خۆت بچۆ بۆ ئەم کارەی خوا

فەرمانی داوە بۆی بچیت ئەتۆ
وەلالاهی ئێمەش وا نالێینە تۆ

وەك جولەکەکان ووتیانە موسی‌ی تۆ (١)
لەگەڵ خوای خۆت بۆ جەنگ کردن بچۆ

ئێوە هەردوکتان لەوێی جەنگ بکەن
ئێمەش ها لێرە ئەوا دانیشتووین

بەڵام ئەتوو خوات بچۆون جەنگ بکەن
ئێمەش لەگەڵتان دەهێین جەنگ ئەکەین

وەلالاهی گەر تۆ بۆ بەرکوالغیمادمان(٢)
ببەیت ئێمە لەگەڵتین هەمومان

لەم کاتا پەیغەمبەر دورودی خوای لە سەر
دوعای بۆ میقداد(٣) کرد ڕەزای خوای لەسەر

لە دواییدا فەرمووی ئەی خەڵك تێکڕاتان
بۆ لای من وەرن بۆ بیر و ڕاتان

---

(١) بڕوانە ئایەتی ژمارە ٢٤/بیستو چوار لە سورەی مائیدە •

(٢) حازمی خوالێخۆشبوو ئەڵێت بەرکوالغیماد شوێنێکە لەپشت مەککەیە ڕێی پێنج شەو دورە لە ناوچەی دەریاوە بڕوانە پەرتوکی قەستەلانی ج/٩/ لاپەڕە/٣٣٤ •

(٣) بەر لە ئیسلامدا کوڕی عەمری کوڕی سوعلەبەی کوڕی مالیکی کوڕی ڕەبیعەی کیندی بوو ، بڕوانە قەستەلانی بەرگی ٨/لابەڕە/٣٨ •

زو لــه وەلامـــا لـــه ئەنســـاريان
سەعدی مەعازی گــەورەی ئەو ســیان(١)

(ده‌خ)

**ووتی ئەی ڕەسولی‌خوا وەك بلێی مەبەستت**
**تەنیا ئێمەیە لـــە ووتـــار و فەرمـــانت**

پەیغەمبەریش لەم کاتا دورودی خوای لەسەر
ووتی بەڵێ مەبەســتم ئێوەیــە لــە ووتار

سەعدیش لـــە وەلام ووتی ئێمە گشـــتمان
ئیمـــان و بـــاووڕی و ســیقە و ڕاســتیمان

بە تۆ هێنـــاوە و پەیمـــانی خۆشـــمان
لەگەڵ تۆ بەســتاوە بـــەر لەمـــە پێشـــمان

ئەتۆ خۆت بچـــۆ بۆ ئـــەم کارەی خـــوا
فەرمـــانی پێدای تـــۆ بچیت بۆ ئەمـــا

بە مافی ئەم کەســەی سوندبێت کە ئەتۆی
ناردیە ئەگـــەر تۆ بۆ ئـــەم دەریایـــەی

تێکڕامان ببـــەیت لەگەڵ خـــۆت ئەتـــۆ
چووینە نێو دەریا ئێمـــەش لەگەڵ تـــۆ

بە گشتی دەهێن ناخـــۆش نیە لاشـــمـــان
بەیانیش ئەتـــۆ ئەگـــەر هەمووشـــمان

بۆ گــژ دوژمن ببــەیت لەگــەڵت دەهێین
لە جەنگ ئێمەشـــین گشت ئـــارام گـــرین

(١) بڕوانە پەرتوکی نوڕوالیەقین/لاپەڕە/١١٠ .

ڕاست گۆشین ئێمـە لە گەیشـتنە دوژمن
بۆ فەرمـانی‌شت هـەردەم حـازرین

لە خواش تکایـە پیشـانت بـدات
لامان ئەم شـتەی گەش ئـەکا چـاووت

پەیغەمبەریش لەم کاتا دوروودی‌خوای لەسەر
دەرەوشاوە ووتیـە سـوپا و لەشـکر

بـۆ مزگێنی‌تـان وەالالاهی وەك بڵێـم
ئەمن تەماشای سـەرکەوتنی گەل ئـەکەم

ئەمجا لەم ڕسـتە سوپا و گـەڵ زانیان
جەنگ کردن بـۆ خوا واجبـە لـە سەریان

لە ڕەوحاش دەرچـوون بـەرەو لای بـەدر
بە یـادی ئەالالاهـو ئەکبـەر بـۆ نـەسر

وەك سوپای ئیسلامیش نزیك بوو لە بەدر
(د٠خ)
وابـوو لـەم کاتیش سـەییدی سـەروەر

ئیمامی عـەلی و زوبەیـری بـە جاسـوس
بەرەو لای دوژمـن نارد بۆ دەنـگ و باس

ئەوانیش لە پێش‌دا وەك چوون هەردوکیان
لە ڕێی گەیشـتنە ئـاوکێشی قوڕەیشـیان

دو منالیـان گرت لـە نەوەی سـەهیان
لە بەرە مـالی حەجاجاج بـوو یەکیـان(١)

(١) ناوی ئەسلەم بوو خولامی ئەسوەد بوو بڕوانە تەفسیری خازین لە سورەی ئەنفال بەرگی/٢/لاپەڕە/١٨٣ ٠

له تیرەی عــاس(١) بوو ئەمــەی تری‌شیان

(د٠خ)

بۆ لای پەیغەمبەریان بــردن هــەردوکیان

(د٠خ)

پەیغەمبەریش لەم کاتا لــە نوێژێی دابــوو

له مناڵەکانیــان پرســــیار کردبـــــوو

ئێـــوە چ کارەن لــــە مناڵی کـــوێن

ئەوانیش ووتیــان ئـاوکێشی قورەیشــین

ئێمەیان نــاردوە ئاویـــان بۆ بکێشـــین

لێیان‌دان چونکە بــە گومان و شـــکیان

وایــان زانی بـــوو هەردوك لــــەوانن

لــە منــــاڵانی ئــــەبی ســـــەفیانن

ئــە دوای لێ‌دانیش ووتیــان هــەردوکمان

منــــاڵی ئــەوین لــەم‌کات بەریــــان‌دان

(د٠خ)

پەیغەمبەریش لەم کاتا وەك لــە نوێژ بۆوە

بە زوبەیرو ئیمــامی عـــەلی ووت ئێـــوە

لێتان‌دان لـــەم کات ڕاســـتیان پێ ووتن

بەریشتان دان لــەم کات درۆیــان پێ‌ووتن

فەرمووی وەالاهی قورەیشین هەردوکیان

لە دوایی‌یـا پێی ووتن ئێــوە هەردوکتان

---

(١) ناوی ئەبو یەسار بوو خوڵامی بەرەماڵی عاسی کــوڕی سەعد بوو ، بڕوانە تەفسیری خازین بەرگی/٢/لاپەڕە/١٨٣ ٠

پێم بڵێــــن بــــاسی قورەیشـــیەکان
ئەوانیش ووتیـــان گــەلی قورەیشـــیەکان

لە تەك ئـــەم گردەن ئەمەتـــەن گشتیان
(د٠خ)
پەیغەمبەر فەرمـــووی چەندە ژمـــارەیان

ئەوانیش ووتیــــان نازانین چەنـــدن
بۆ دوەمین جاریش هەمیســـیان پێی ووتن

پێـــم بڵێن ئایـــــە لە هەمـــــوو ڕۆژان
چەند ووشتر ســـەرئەبڕن قورەیشـــیەکان

ووتیان ڕۆژ وایـــــە نۆیان ســـــەرئەبڕن
ڕۆژیش وا ئـــەبێت دەیان ســـــەرئەبڕن
(د٠خ)
پەیغەمبەر فەرمـــووی ئـــەم گەلـــە لە نێوان
نۆ سەت و هـــەزارە دوبـــارە لە پاشـــان

لێی پرســـین بـــاسی قورەیشـــیەکان
کە کێ و کێ هاتـــووینە لـــە ســـەرۆکەکان

منداڵـــەکانیش ژمارەیـــکی زۆریـــــان
بۆباس‌کرد لەناوی سەرۆکە قورەیشیەکان

لەم کاتا پەیغەمبەر دورودی خـــوای لەسەر
لە منداڵەکانی کـــە وەرگـــرت خەبـــەر

ووتیە هــــاوڕان و هەڤـــاڵانی خـــۆی
ئەمەیـــە مەکەکـــە پارچـــە جگەری خـــۆی

تێکرا دەرکردیـە بــۆ لای ئێوەتـــان

لە دوایی‌یا لـــەوێش ڕەسولی یـــەزدان

ڕۆیشت تـا چـوە ڕۆخ دۆڵی بـەدر بێ(١)
لە ڕوی مەدینـــە لـــە زەوێی بـــەخێ

پاو ســـــمی وولاخ ڕۆ دەچوو لـــە خێ
بە دوریش لـە ئاو دابـــەزی لـــەوێی

**(باسی چۆنیەتی باران بارین بە ئەمری یەزدان بۆ فریای)**
**(موسوڵمانەکانو ئازاردانی گاوورەکان لە)**
**(خاکی بەدر لەم کاتا)**

موسوڵمانەکان لـــە بەدر بـــۆ رژابوون
بەیانیش هەروەك لـە خـەو هەسـتابوون

پێویستیان بە ئاو ببوو پەرۆش بوون (٢)
بۆ ئاو خواردنـەوە و هـەم بۆ خۆ شوشتن

بۆ وولاخان و بـۆ دەست نوێژ شـــۆرین
بۆ ڕێژە و پێـــژە و بۆ ئاو هەڵگـــرتن

سـەرەڕای ئەمـەش شـەیتانی مەلعـون
بە پسـە پس کـردن دڵی پیس کـردبوون

پێی ووتبـوون مـوشریك چاوەڕوان تـانن
لــــە بێ ئاوی‌یـــا بتان‌خنـــکێنن

(١) بروانە ژمارەی ئایەتی /٤٢ لە سورەی ئەنفال ٠
(٢) بروانە ئایەتی ژمارە /١١ هەتا/٢٧ لە سورەی ئەنفال ٠

لەم کاتیشا بەزەیی پێکردن یەزدان (١)
بۆی هەناردنە خـــوار لە ئاســـمان باران

بـــاری هەتــــا دۆڵ لە ســــەری ڕژاوە
دەستنوێژیان لێشوشت ئاویانخواردەوە

چێشت و نانیشیان بـــۆ خۆ دوروست کرد
دێمکە و کوندەشـــیان هەموو پڕ ئـــاو کرد

هەرواش چەند حەوز و عەمامـــارە ئاویـــان
لە ڕۆخــــەی دۆڵێ لێدان بۆ خۆیـــــان

تـــۆزی خـــۆڵو خێش بـــە باران کـــەپ بوو
تفری ســـەرزەویش شـــوراوە تونـــد بوو

تـــا وای لێهاتبــــوو ســــمی وولاخ و پێ
لە قوڕی ســـەر زەوی نەدەچـــوە خـــوارێ

کە ئـــــەم بارانەش باری بــــوو لەوێ
بۆ ســـوپای ئیســــلام ببــــوە فریـــــایی

بـــــۆ گاورەکانیش ببـــــوە زیــــــان
نەیانتانی بارکەن لـــە نێو قوڕێمــــــان

چونـــکە جێ و شوێنی موســــوڵمانەکان
خێ بوو قـــوڕیش بوو جێـــگای گاوورەکان

بەڵام گـــاووریش پێش ئـــەوان چوو بوون
لە ڕوی لای مەکـــەکە لێ ئۆتـــراخ ببـــوون

---

(١) بڕوانە پەرتوکەکانی محمد ڕەزاو نوروالیەقین/لاپەڕە/١١٢ .

لـــه ڕۆخ دۆڵێ‌کا دور لـــه بـه‌در بـــوو
کانی بەدریشـــیان داگــــیر کردبــــوو

چه‌ند بیریێ‌کی‌شـــیان لـه خاکی بـه‌در(١)
بۆ خۆ لێ‌دابوون کردبویانـــه عه‌مامـــار

بۆ ئه‌مـــه‌ی ئـــاوی کۆنـــه بـــیره‌کان
خـــڕ بکه‌نـــــه نێو بــــیره تـــازه‌کان

تا خـــــۆو وولاخیـــــان لێ‌بخۆنـــــه‌وه
کۆنه بـــــیرانیش پـــڕ بکه‌نـــــه‌وه

په‌یغه‌مبه‌ریش له‌م‌کاتا دورودی خوای له‌سه‌ر
له‌م شـــه‌وه هه‌تا به‌یـــانی و ســـه‌حه‌ر

هه‌ر ئه‌پاڕاوه لـــه خودای قه‌هاهـــار(٢)
له ژێـــر داریێ‌کا هه‌تـــاکو فه‌جـــر

هه‌ر نوێـــژی ئه‌کرد ســـه‌جده‌ی زۆر ئه‌برد
یادی قه‌یویـــــوم و حه‌یی‌ی زۆر ئه‌کــــرد

ئیمـــامی علی‌یش ڕه‌زای خوای لـــه سه‌ر
ووتی وه‌ك ڕۆن بـــوو به‌ری لای فه‌جـــر

(د٠خ)
په‌یغه‌مبه‌ر بۆ نوێژ تێکـــڕای بانگ کردین
له ژێر داره‌کـــه‌ش پێش نوێژی بـــۆ کردین

---

(١) بڕوانه په‌رتوکی نورو‌الیه‌قین/لاپه‌ڕه/١١١ ٠

(٢) بڕوانه په‌رتوکی محمد ڕه‌زا /لاپه‌ڕه/١٦٥ ٠

(د٠خ)

له دوای نوێــژی شا ڕەســـولی مەنانـــان
ووتارێـــکی دا بـــۆ جەنگ هـــانیدایـن

## (باسی چۆنیەتی بنیاتنانی عەمارە ئاوی)
## (موسوڵمانەکان لەسەر بیری بەدر)

حوبابابی کوڕی(١) مونزری (٢) ئەنساری
ناوبانگی هەبـــوو لــە ڕاو تەکبـــیری

(د٠خ)

ووتی‌یە پەیغەمبـــەر ئەی ڕەســـولی خوا
ئایە ئـــەم جێیـــە جێـــگایێ‌کا خـــوا

تۆی لێ دانـــاوە ئێمـــە نەتوانـــین
نە بـــۆ پێش بچـــین نە بۆ دوا بچـــین

یان ئەم جێگایـــە شـــوێنێکی وایـــە
جێی جـــەنگ و فێـــڵ و جێی بـــیر و ڕایە

ئەم جێگاو شوێنـــە جێـــگای تۆ نیـــە
بە خەڵك پەلـــەکە هەتـــا تۆ دەچیـــە

ســـەر ئـــاوێ نزیـــك لای قورەیشـــیەکان
ئەمن شـــارەزام لەم جێـــگاو مـــەکان

زۆریش بە ئاوە جێـــگاکەی ئـــەوان
لێی دادەبـــەزین ڕو بـــە ڕوی ئـــەوان

---

(١) بڕوانە پەرتوکی نوروالیەقین/لاپەڕە/١١٢ ٠

(٢) منذر ٠

بـــيرەکانی تـــریش گشت دەرمێ نـــین
حەوزەکیش لەســـەر بنیاتنـــان دەکەین
لێی ئەخۆینـــەوە پـــڕیشی ئاو ئـــەکەین
لە ئـــاو ئـــەوانیش قەدەغە ئـــەکەین

لە دوایی یا پەیغەمبەر دورودی خوای لە سەر
لە وەڵام ووتی یـــە حوبابـــابی مونـــزر

ڕایەکی چـاکت دەربـــڕی لـــە بڕیـــار
(د٠خ)
ئەمجا پەلەی کـــرد ڕەســـولی نـــازدار

ڕۆیشت تا چـــوە نزیكتـــرین ئـــاوێ
لای قوڕەیشـــیەکان دابـــەزی لـــەوێ
(د٠خ)
لە هەمان کاتی شـا ڕەســـولی یـــەزدان
فەرمانی دەربڕی بـــە ڕمـــانی بـــیران

بۆ ئەمەی لـــە ئاو هیـــوای مـــوشری کان
ببڕێ تن پێشیان نـــەدەن موســـوڵمان

بـــە زوتـــرین کاتی یش گشت بیرەکانیـان
ڕوخاندە باریـــەك بێ لـــە هێن خۆیـــان

پەیغەمبەر لە کاتـــا دورودی خوای لە سەر
حەوزەکی بینا کرد لـــەم بیرەی چـــوە سەر

**(باسی چۆنیەتی بنیاتنانی سەنگەر بۆ)**
**(پەیغەمبەر (د٠خ) لە خاکی بەدر)**

لەم کاتا لە بـــەدر سەعدی مەعـــازی(١)
گـــەورەی ئەوسـیان خـوا لێی بێت ڕازی

(د٠خ)

ووتیــە پەیغەمبـــەر ئەی نـــەبی یەزدان
ئایە سـەنگەرێك نەکەیـن بنیاتنـــان

بۆ تۆ لـــە نێـــویا دانیشی‌یت بۆ خـــۆت
ئامادەش ئەکـــەین لات وولاخی خـــۆت

لە دوایی‌یا ئێمـــەش بە تێکڕایی‌مـــان
دەرئەچـین بـــۆ گـــژ دوژمنی خۆمـــان

ئەگەر خوا ئێمەی لـــە سەر دوژمنمـــان
بالا کرد ئەمە ئەمـــەی کە ویســتمان

ئەگەر سەرکەوتـــویش نەبووین ئەتـــو
بــە ســواری دەگەیی‌یــە لای ئێمـــەوە زو

(د٠خ)

ئەی ڕەسولی خوا چەنـد گەلێـــکی تـــر
نەهاتن دابـــڕان لەگەڵت بـــۆ شـــەڕ

واش نیــە ئێمـــــە لـــە لایەن خۆمـــان
لەوان پترمـــان خۆش بـــوێت ئەتۆمـــان

بۆ نیازی چـاکە و حەزکـردنی جـەنگیش
فەرمان بەرترنـــین بۆ تۆ لـــەوانیش

گـــەر گومانی‌شـــیان وابایـــە ئەتـۆ
بۆ شەڕ و جەنگ دەهێت دانەدەبڕان لە تۆ

---

(١) بڕوانە بەرتوکی نووواڵیەقین/لاپەڕە/١١٣ ٠

چونکە لای خۆیـان گومانیـــان وابـــوو
مەبەست لە هاینت بـــەس بۆ کاروان بـــوو

خـــوا پاریـــزی تـــۆ بـــەوان ئـــەکاتن
تێکڕاشیان ئەوان لەگـــەڵت جەنگ ئەکەن

لەم کاتا پەیغەمبەر دوورودی خـــوای لەسەر
لـــە وەڵامی ســـەعد ڕەزای خـــوای لەســـەر

فەرمووی ئـــەی ســـەعد چ شـــتێك لای خوا
ئایە لـــــەم چاکتر هەیـــــە لە ئەمـــــا

(د٠خ)
لەدواییش وابـــوو خـــاس بۆ پەیغەمبـــەر
لەسەر گـــردێ کا دوروست کرا ســـەنگەر

شـــێوەی بولونـــدی گردەکـــەش وابـــوو
بەسەر مەیـــدانی جەنـــگا مـــوشریف بـــوو

ســـەنگەر شـــتێك بـــوو وەك چـــادر وابوو
سێبەری هەبـــوو لە دار خورمـــــا بـــــوو

(د٠خ)
پەیغەمبەر لەگـــــەڵ ئیمـــامی ئەبوبـــــەکر
بە یەکەوە هـــەردوك چوونە نێـــو سەنگەر

سەعدی مەعازیش بـــە خۆ دەست بـــە شیر
وەســـتا بـــــە پاوە لـــــە قاپی ســـــەنگەر

تـــاقمێ تـــــریش لـــــە ئەنســـــاریان
مانـــەوە لای ســـــەنگەر بـــــۆ پاراستنیان

## (باسی چۆنیەتی پەیابوونی ناکۆکی لە نێوان)
## (سەرۆکە گاورەکان لە بەدر)

سوپای ئیسلامیش وەك گشت کۆبۆوە
خۆشەویست پولەکانی گشت ڕاستکردەوە

هەموویانی تێکرا شان بە شانی یەك
وەك خشتی دیوار نوساندە بار یەك

(د•خ)
وابوو لە دوایش ڕەسولی مەنانان
وەك چاوی پێکەوت بە قورەیشیەکان

پاڕاوە لە خوا ووتی ئەی یەزدان
ئەمەن قورەیشی بە لافو گەزافیان

ڕوویان تێکردین تۆش ئەبوغزێینن
(د•خ)
پەیغەمبەری تۆش بە درۆ ئەزانن

ئەی خوایە بمدیێ ئەم سەرکەوتنەکەی
بلێنت دابوە من بەر لە ئەم کاتەی

لەم وەختە ناکۆکییەك ڕویدا لە نێوان
سەرۆکەکانی سوپای موشریکان

هۆی ڕوداوی ناکۆکییەکەشیان (١)
ئەمە بوو یەکێ لە سەرۆکەکان

---

(١) بڕوانە پەرتوکی نوروالیەقین لاپەڕە/١١٣ •

عوتبەی(١) کوڕی ڕەبیعەی(٢) ناو بوو
ویستی خەڵك لە جەنگ قەدەغەکات هەموو

بەم شێوەیە هەستا ووتارێکی دا
لە نێو قوڕەیشیان قسەی کرد دوا

ووتی ئەی گەلی قوڕەیشیەکان
وەاللاهی ئێوە بە هەموو لایەکتان

هیچ جۆرە شتێکتان بۆ نابتە بەرهەم
لە گەیشتنە محمد(د•خ) و هەڤاڵانی ئەم

وەاللاهی ئەگەر ئێوە لێتان دا
دوژمنانی‌تان لە نێو ڕۆ ئەدا

هەتا هەتایەش پیاو هەر بە چاوی
خراپە تەماشا ئەکاتە پیاوی

چونکە ئەبینێت ئامۆزای کوشتیە
یان کوڕە خاڵێکی ئەم پیاوی کوشتیە

یان یەکی کوشتیە لە نەتەوەی ئەم
ئەی‌کوژی‌تەوە لە جیات کوشتنی ئەم

ئەی قوڕەیشیەکان ئێوە هەمووتان
گشت بگەڕێی‌نەوە بچۆنەوە دواتان

---

(١) باوکی هیندی خێزانی ئەبی سەفیان بوو بڕوانە پەرتوکی قەستەلانی ، بەرگی /٧/لاپەڕە/ ٣٩١ •

(٢) کوڕی عەبد شەمس بوو بڕوانە خازین بەرگی/٢/لاپەڕە/١٩٢ •

لە نێوان محمد و گەلی عەرەبیش
ئێوە واز بهێنن ئەگەر یەکێکیش

جگە لە ئێوە محمدی کوشت
ئەمە زۆر چاکە ئێوەش ئەمەو ویست

من دەدەم خوێنی سوندخۆرەکەی خۆم
عەمری حەزرەمی(١) لە سامانی خۆم

ئەمەی لە لقی عەبدوالالای جەحشی
کوژرابو دەشدەم خوینی وولداشی

بە تێکڕاییشتان ئەی گەل ئێمڕۆکە
بڵێن لای خۆتان عوتیە ترسنۆکە

هەمووشتان ئەزانن ئەمن لە ئێوە
ترسنۆکتر نیم ڕو بە ڕوی ئێوە

وەك گەیییە ئەبوجەهلیش قسەکەی عوتبە
ناوی بەدو خست ترسنۆکە عوتبە

سوێندی خوارد ووتی وەالالاهی بۆ دوا
ناگەڕێیی نەوە ئێمە هەتا خوا

---

(١) وابو لە جەنگێتر بەر لە جەنگی بەدر موسولمانەکان ڕێگایان لە کاروانەکی تری قورەیشیان گرت لەمان عەمری حەزرەمییان کوشت عوسمانو حەکیمیشیان گرت نەوفەلیش لەبەردەستیان ڕایکرد ، بڕوانە پەرتوکی نوروالیەقین لاپەڕە/١٠٤ .

حـــوکم ئـــەکاتن بەخـــۆی لە نێـــوان
(د٠خ)
ئێمـــە و محمـــد لـــە جـەنگ کردنمان

## (باسی چۆنیەتی هێرش بردنی موشریکەکان بۆ سەر)
## (عەمامارە ئاوی موسوڵمان لە جەنگی بەدر)

کەمێ بەر لـــە جەنگ لە پـــولی موشریکان
ئەسوەدی عەبـــدوا الاســـەد چوە مەیـــدان

ووتی من لەگـــــەڵ خوا ئەکەم پەیمـــان
ئاو بخۆمـــــەوە لە حەوزی ئیســـــلامان

یان ئـــەبێت بچـــم من حەوزەکەیـــان
لێبڕوخێنم خـــۆم بمـــــریێنم یـــان

لە نێو مـــوشریکان ئـــەویش وەك دەرچوو
بە خۆ هەرکێشـــان بۆ عەمامـــاراو چوو

لە ســـوپای ئیســـلامیش ئیمامی حەمـــزە
مامی پەیغەمبـــەر بۆی دەرچـــوو ئـــازا

لە نزیـــك عەمامـــاڕاو شـــیرێکی لێدا
بە لێـــدانێکا لاق و پـــای پـــەلدا

بەربۆوە ســـەر پشت تەکانی خـــۆی دا
لەسەر قینـــگ خستی بەســـەر زەویدا

بـــە هێـــرش بـــردن ڕۆیشت بـــە هەشـــتاو
بۆ گەیانـــدنە ســـووێند بۆ نێـــو عەماماڕاو

چوو نەگەڕاوە تا نێو عەماماڕاو
ئیمامی حەمزەش چووە دوای بە تاو

چوو گرتی کوشتی لە نێو عەماماڕاو
لە مەخزومیش بوو ئەمەی ناوبراو

برای عەبدوالالای عەبدوالاسەد بوو
ئەم کۆنە مێردی ئومی‌می سەلەمە بوو(١)

## (باسی چۆونیەتی دەست بە جەنگ کردنو دەرچوونی)(٢)
## (هەردوو لایان بۆ یەکا لە گۆڕەپانی جەنگ)

وەك هەردو سوپاش بەرەو مەیدان بوون
بۆ شەڕو جەنگ کردن ڕوبەڕوی یەك بوون

پێشەکی سێ کەس لە پولی موشریکان
جودابونەوە دەرچوون بۆ مەیدان

عوتبەی ڕەبیعەو شەیبەی برای بوو
ئەمەی تریشیان وەلیدی کوڕی بوو

چوونە مەیدانێ بانگیان کرد ووتیان
ئێمە ئەمانوێت هاوسەری خۆمان

بۆ مەیدانی جەنگ دەربچن بۆمان
ئازانەش سێ گەنج لە ئەنساریان

---

(١) خێزانی پەیغەمبەری خۆشەویستمان بوو (د.خ) ناوی هیند بوو کچی ئەبی ئومەیەیەی بوو .

(٢) بڕوانە پەرتوکەکانی محمد ڕەزاو نوڕوالیەقین/لاپەڕە/١١٤ .

دەرچوون بۆ لایان وەستان لە پێشیان
وابوو لەم کاتا ئەوانیش پرسیان

ئێوە کوێندەرین چ کەسن هەرسێکتان
وەڵامیان داوە ئەوانیش ووتیان

عەوفو(١) عەبدوالالاو(٢) مەعازە(٣) ناومان
مە لقی ئەنسارین ئێمە هەرسێکمان

وەك تێیان گەیشتن پێیان ووتنەوە
بۆ هیچ پێویست نین ئێمە بە ئیوە

تەنها مەبەستمان گەلی خۆمانە
با بۆ جەنگ بۆمان دەرچن ئەمانە

بە دەنگیش هەرسێکیان بانگیان کرد ووتیان
تۆ ئەی محمد (د۰خ) ڕەوان کە بۆمان

لە ئاوکوفان و هاوسەی خۆمان
لە کوڕە مامانو لە گەلی خۆمان

لە دوییدا پەیغەمبەر دوورودی خوای لەسەر
بانگی کردنەوە بۆ ڕێزی لەشکر

فەرمووی بۆ جێتان بگەڕێنەوە
با کوڕە مامیان بۆیان هەستنەوە

---

(١) عەوفو مەعاز هەردوکیان کوڕی حاریسی ئەنسارین دایکیان ناوی عەفراء بوو ، بڕوانە محمد ڕەزا/١٦٧ ۰

(٢) کوڕی ڕەوواحەی ئەنسارییە ، بڕوانە پەرتوکی محمد ڕەزا/لاپەڕە/١٦٧ ۰

فەرمووی عوبەیدەی(١) حاریس تۆ هەڵستە
ئەی حەمزە(٢) هەڵستە ئەی عەلی هەڵستە(٣)

عوبەیدەش هەڵسا تاوی دا عوتبە
ئیمامی حەمزەش تاوی دا شەیبە

ئیمامی عەلیش ڕەزای خوای لەسەر
تاوی دا وەلید بە خۆ بە شمشێر

حەمزەو عەلی وەك چوون هەردوكیان
شەیبەو وەلیدیان كوشت لە نێو مەیدان

عوبەیدە و عوتبەش هێرشیان بۆ یەك برد
بە یەك و لێدان یەكدیان زامدار كرد

لە دوایی یا حەمزەو عەلی بۆ دوایان
گەڕانەوە سەر عوتبە بە شیران

بە زامداریان كوشت لە گۆشەی مەیدان
بە زامداریەوەش عوبەیدەشیان

هەڵگرت لە نێویان بو لای هەردوكیان
خووێنی ئەچكاوە لە لاق و چۆكان
(د٠خ)
بە پای بڕاوەش بۆ لای پەیغەمبەر
چوون بردیانەوە ڕەزای خوای لەسەر

---

(١) ئامۆزای پەیغەمبەر بوو (د٠خ) ٠
(٢) مامی پەیغەمبەر بوو (د٠خ) ٠
(٣) ئامۆزای پەیغەمبەر بوو (د٠خ) ٠

لەسەر تەنیشـــتیان بـــە پاڵ دانـــەوە
لە زەویی درێـــژ کرد لـــە تەك ئەمـــەوە

(د٠خ)
پەیغەمبەر ئەژنۆوی خۆی بۆ خستە بن سەر
سەر یعوبەیـدەی بـــە خۆ خســـتە سەر

(د٠خ)
لەم کاتـــا پەیغەمبەر بەشـــارەو مزگێنی
بە عوبەیـــدەی دا بە شـــەهید بـــوونی

(د٠خ)
عوبەیدەش ووتی ئـــەی ڕەســـولی خـــوا
وەالالاهی لام خۆش بوو ئەبوتالیب زندی با

ئەیـــزانێت ئێمە لـــە پاراســـتنی تۆ
لەم چاکتـــر دوژمن پـــاس ئەکەین لـــە تۆ

وەك بە قســـەش ووتی ئێمە تێکڕامـــان
(د٠خ)
پارێـــزی محمـــد ئەکەیـــن لە زیـــان

تا لە دەورەی ئـــەم لە پاس کردنمـــان
خۆمان بە کوشـــتن ئەدەین هەمومـــان

بەم خافـــریش ئەبین لـــە دەورو پشـــتی
لە ژن و منال و بـــاوك و دایـــك گشـــتی

لە گەڕانەوەش عوبـــەیدە لە ســـەفرا(١)
کۆچی دوایی کـــرد هەر لـــەوێش نێـــژرا

---

(١) شوێنێکە لە نێوان بەدرو شاری پەیغەمبەر (د٠خ) ٠

لــه دوا کـــوژرانی هەرسێ مــوشری‌کان
بە دەستی حەمـــزە و عــەلی لە مەیــدان

(د٠خ)
پەیغەمبەر لە سەنگەر(١) بۆ نێو سوپا چوو
بۆ ڕاست کــــردنی پولەکان دەرچـــوو

تیرێکی لە دەست بــوو بێ سەرو پــەڕ بوو
بەلای ســـەوادی غوزیـــە تێپەڕ بـــوو

لە ڕیزی پـــولان ئەمیـــان دەرچـــوو بوو
(د٠خ)
پەیغەمبەر تیرێــکی لـــە زگی دابـــوو

پێی ووتبوو ئەتۆ ئەی ســەواد ڕاست‌بەوە
ســـەودایش ووتی لــــە وەڵامـــەوە
(د٠خ)
ئەی ڕەســولی خوا تـــۆ ئەمنت هێشـــاند
بە ماف و ڕاســـتیش خوا ئەتـــۆی هەنارد

مـــافی لێدانـــم لێت ئەوێـتـــەوە
(د٠خ)
پەیغەمبەر زگی خـــۆی بۆ ڕوت کـــردەوە

ووتی ئەی ســـەواد ئەتـــۆش لێـــمدەوە
سەوادیش زگی ماچ کرد بە دەست لە ملەوە
(د٠خ)
پەیغەمبەر پێی ووت ئەتـۆ ئـەی ســەواد
ئایا چ شتێکت توش بــوو ٠٠ ئەمەت کــرد

---

(١) بڕوانە پەرتوکی نوڕوالیەقین/لاپەڕە/١١٥ ٠

(د٠خ)
سـەوادیش ووتی ئـەی ڕەسولی خـوا
چی تـۆ ئـەی‌بینیت ئابلۆقـەی درا

ویستم نوسـانی پێستم بـە پێستت
ببتە دوا جـاری ماچ کـردنی پێستت

(د٠خ)
پەیغەمبەریش لـە کاتـا بـە چاکە داوای
لە خواوە کـرد بۆ سەوادی غوزیـەی

وەك لە ڕاست کـردنی پـولانیش بـۆوە
ووتارێـکی دا لـە نێـو سـوپاوە

لـە ووتارەکەشـا سـوپاکەی هـاندا
لە بارەی جەنـگ کردن بـۆ ڕەزای خودا

پێی ووتن ئەگـەر گەلی مـوشریکان
نزیك بوون لێتـان بیانگرنە بەر تـیران

دەریش مـەکێشن شـیران لـە کالان
تـا داونەپـۆشن گـەلی موشریکان

(د٠خ)
لە دوای ڕاست کـردنی پـولان پەیغەمبـەر
لەگەڵ ئەبو بەکـر چـووە نێـو سـەنگەر

## (باسی چۆونیەتی هێرش بردن و پەلاماردانی)
## (هەردو سوپا بۆیەکا لە گۆڕەپانی جەنگ بە زۆری)

(د٠خ)

لە دوا چوونـەوەی پەیغەمبەر بۆ سـەنگەر
هەردولا نزیـك بوون بـۆ یەك چوونـە دەر

تا چەنـد کەسێ کیش لـە قورەیشـیەکان
ڕۆنیشتن بـۆ لای سـوپای موسـوڵمان

نەوەستان تـا سەر عەمامـارە ئـاو چـوون

(د٠خ)

پەیغەمبەر فەرمووی ئێـوە لێیان گـەڕێن

هەرچی چـوو ئـاوی خـواردەوە کوشتیان
بەس حەکیم(١) نەبێت ئیسلام بوو هێشتیان

لەم کاتا پەیغەمبـەر دورودی خـوای لەسەر
فەرمانی بـە سـوپادا بێ‌ی ئەم نەچنـە دەر

(د٠خ)

وابـوو پەیغەمبـەر لەبـەدر لـە سـەنگەر
داوای کـرد پاڕاوە لـە خوا بـۆ نـەسر

لە داواش فەرمووی ئـەی خـوا ئەگەر تـۆ
ئەم گەڵەی ئیمـاندار لە نێـوبەیت ئیمـڕۆ

لەسەر ڕوی زەمـین تـۆ ناپەرسـترێ‌یت

(د٠خ)

ئەبوبەکری سددیقیش بە پەیغەمبەری ووت

---

(١) کوڕی حیزام بوو ٠

(د٠خ)

ئەی ڕەســـولی خوا خــــوا کافیە بۆ تـــۆ
بــەجێش ئەگـــەینێت بڵێنی خۆی بۆ تـــۆ

لە دوایی یا پەیغەمبەر دورودی خوای لەسەر
بە ئایەت خووێندنەوە(١) دەرچوو لەسەنگەر

سووێندی خوارد فەرمووی بەم کەسەی قەسەم

(د٠خ)

گیانی محمدی بـــە دەستەوەیـــە ئـــەم

هەر پیــاوێ ئیمـــڕۆ بچێت جەنـــگ بکا
لە دژی ئەمانــــــە بـــۆ ڕەزای خــــودا

لە جەنگ بکـــوژرێت نەکشێ تـــەوە دوا
بۆ نێو بەهەشــــــتی ئەبـــاتن خــــوا

عومەیری حەمامیش(٢) ڕەزای خوای لەسەر
قەسپی لە دەست بوو دەیخوارد لەدیارشەڕ

(د٠خ)

لەگەڵ گوێی لێبوو لــە ووتەی پەیغەمبەر
قەسپەکەی دانـــا دەســـتی دایە شـــیر

بە ووشـــەی بەخ بــەخ دوا لە دوایــە ووتی
ئایـــــا نێـــــوانی من و بەهەشـــــــتێ

---

(١) ئایەتەکەش ئەمەبوو (سیهزم الجمع ویولون الدبر) ئایەتی ژمارە/٤٥ لــە سورەی قەمەر ٠

(٢) کوڕی جەموحی کوڕی زەیدی کوڕی حیرامی ئەنساری سەلەمییە ، خالیدی کــوڕی ئەعلــەم شەهیدی کــرد ، بڕوانــە پەرتــوکەکانی ئوســدوالغابەو نورواليەقین/لاپەڕە/١١٥ ٠

بەس هەر هەندەیـــە بم کـــوژن ئەمانـــە
ڕاپەڕیە نێـــو جـــەنگ چۆوە مەردانـــە

بێ ووچان جەنـــگی کرد تـــا لە نێـــو مەیدان
گیانی شەهید کـــرا چـــوە باغی جینـــان

لـــە دوای ئەویی‌شـــا خوالێخۆشـــبووان
عەوف و(١) میهجەع و(٢) حاریسە(٣) کوژران

لەم کاتا شـــەڕ تیر بوو گەرم بـــوو مەیـــدان
هەردولا هاتنـــە یەك بـــە شیر و تـــیران

ژمارەی ئیسلام کەمتـــر بوو لـــە گاووران
وابوو لەم ئەسـنـاش خـــودای میهـــرەبان

هەزار فریشتەی چەکداری لـــە ئاسمان(٤)
لەگەڵ جوبرائیل بـــە سواری ئەســـپان

بە هیمداد بۆ ئیســـلام هەنـــاردە مەیـــدان
ئەوانیش جەنگیان کرد(٥) وەك جەنگاوەران

---

(١) دایکی ناوی عەفـــراء کچی عوبیدی سوعلەبەی دارتاشیان بـــوو باوکیشی ناوی حاریس بوو ، قستلانی/ج٨/١٣ •

(٢) خولامی عومەری کوڕی خەتتاب بوو رەزای خوایان لەسەر •

(٣)کوڕی سوراقەی ئەنساری بوو ، بڕوانە محمد ڕەزا/لاپەڕە/٥/١٦٩ •

(٤) بڕوانە ئایەتەکانی ٩/١٠ لە سورەی ئەنفال •
بڕوانە تەفسیری خازین بەرگی ٣/لاپەڕە/١٧٩ •

(٥) جوبرائیل پێنج‌سەد فریشتەی لەگەڵ‌بوو میکائیلیش پێنج‌سەدی لەگەڵ‌بوو لەسەر وێنەی پیاوان بوون سواری ئەسپی بلەك بوون جلی سپیان لەبەربوو خازن/٣/١٧٩ •

کاتێ پێ نەچــوو بــە بەزەیی یــەزدان
ئیسلام سەرکەوت گــاوورەکان شــکان

بەم شێوەیە ئەمانەی دیل بــوون دیل کران
کــوژراوەکانیش لە مەیــدان کــوژران

بە سەر شۆڕیــەوەش ئەمانــەی تریــان
لە ترسی ئیســلام ڕایــان کــرد لە مەیــدان

سوپای ئیسلامیش چــوو کەوتــە دوایــان
بە هەمە چەشــنەش لێیــاندان زیــان

وەك لە ســورەتانی ئەنفــاڵ و ئــالی عیمران
بەیــانی کــردوە خــودا لە قورئــان

پەیغەمبەریش لەم کاتا دوروودی‌خوای لەسەر
جوبرائیلی دیتبوو لە جەنــگی بــەدر(١)

سەری ئەســپەکەی بــە دەست وەگرتبــوو
چەك و پێویســتی جەنــگی لەســەر بوو

هەر لەم کاتیشــا جوبــریلی دیتبــوو
دیتبووشی غوباری لــە دران نیشــتبوو

پیــاوێ کیش ووتی لــە تــیرەی غەفافار
ئەمن‌و ئامــۆزام موشریك بــووین شەررار

چووینە سەر چیــایێ موشریفی بــەدر
ئەمان ڕۆینە نێــو گــۆڕەپانی شــەڕ

---

(١) بڕوانە پەرتوکی محمد ڕەزا/لاپەڕە/ ١٧١ ٠

بۆ ئەمەی بزانـــین لـــە ئەنجامی شـــەڕ
کێ سـەرئەکەوێت لـە ئیســلام و گاوور

تا ماڵ بە تـــاڵان ببەین بـــۆ خۆمـــان
پارچە هەورێـــك هات نزیك بـــوو لێمان

لە نێو هەورەکـــەش ئاوا من بە خـــۆم
حیلـەی ئەسـپانم بیست بـە گوێی خۆم

یـەکێ کیش ووتی پێش کـەوە حەیـزەڕوم
لەم کاتا لـــەوێ مـــرد ئامۆزایـــەکەم

نزیك بوو ئـەمنیش وەك ئـەم لـە نێوچم
وابوو لە دواییـا خۆم گرتـەوە بـە خۆم

ئەبـــو داودی ··· مـــازەنیش ووتی
کەوتمە دوا پیـــاوێ کافری لەعنـــەتی

ئەمـــەویست لێ‌ی‌دەم دیتـم کتوپـــڕ
پێش شیر وەشـــانم سەری پەڕیـــە گۆڕ

جگە لـەمن زانیم لـــەم کاتا یەکێ تـــر
هات کافرەکەی کوشت نـاردیە سـەقەڕ

**(باسی چۆنیەتی ژمارەی شەهیدانی ئیسلام‌و)**
**(کوژراوو بەدیل گیراوەکانی موشریکەکان لە گۆڕەپانی)**
**(جەنگی بەدر)**

ژمارەی کوشـتاری گـــاووران لە بـــەدر
گەیشتە حەوتاکەس نـــە کەم نە زیاتـــر

ژمارەی دیلیشـیان گەیشتە حەوتـاو چوار
جگە لـە زیـــانی‌تر بـــە زۆری بێ‌ژمـــار

لە سوپای ئیسلامیش خوالێخۆشبووان
چواردە جەنگاوەر لە مەیدان شەهید کران

لە دانیشتووانی ٠٠مەکەکەی بوون شەشیان
مەدینەیی بوون هەشتەکەی تریان

ژمارەی دەست کەوتووی ئیسلام لە گاووران
لە جەنگی بەدر لە دوای شەڕ وەستان

ئەمەبوو دە ئەسپ و سەت و پەنجا ووشتر
لەگەڵ ژمارێك لە کەلو پەلی تر

وەك چەك و جلك و قەسپ و کاسەبەڕ
جگە لە ژمارەی چەندەها زیانی تر

لەم کاتا پەیغەمبەر دورودی خوای لە سەر
دو گاووری بە خۆ کوشت(١) لە جەنگی بەدر

یەکەمیان نەزری(١) کوڕی حاریس بوو
دووەمیش عەقەبەی ئەبی موعیت(٢) بوو

ئەبو عوبەیدەش(٣) جەرراحی باوکی
لە جەنگی بەدر کوشت بە موشری کی

ئەبو عوبەیدەش بوو ئەبوالبوختەری(٤)
کوڕی هیشامی کوشت لە نێو شەڕی

---

(١) بڕوانە پەرتوکی نورو الیەقین/لاپەڕە/١١٦ ٠

(٢) ئەویش کوڕی عەلقەمە بوو لە تیرەی عەبدوالدلدار بوو ، بڕوانە تەفسیری خازین ج/٢/لاپەڕە/١٩٠ ٠

(٣) ناوی عامیر بوو لە یەکە مزگێنیپێدراوەکانی بەهەشت بوو ٠

(٤) ناوی عاس بوو ٠

عەمامـاری یاسـیرو بیلالی(١) حەبـەشی
ئومەیەیـان کوشت لەگـەڵ کـوڕیشی

حەنزەلەی کـوڕی ئەبی سـەفیانیش
لە کوژراوانی بـەدر بـوو ئـەویش

کوژراش نەوفـەلی کـوڕی خـوەیلید
بە دەسـتی عەلی شـێری خـوای مەجید

سەعیدی عـاسی کـوڕی ئومەیەیـەش
عوبەیدەو عاسی وێکـڕان کوشت ئـەویش

دوو (٢) جەنـگاوەریش لـە ئەنسـاریان
مەعاز و مـوعوەزی عەفـراء بـوو ناویـان

ئەوانیش ئەبو جەهلی کـوڕی هیشـامیان
لە مەیدان زامدار کـرد بە یەکو هێرشـیان

بەڵام ئـەوانیش یـەك دەستی بـڕا
ئەمـەی تریشـیان چوو شـەهید کرا

بەر لە بـەدریشا سـورەی ئەالرەحمان
وەك لـە مەدینـە لای خـوای میهرەبـان

---

(١) باوکی ناوی رەبباح بوو دایکیشی ناوی حەمامە بوو ٠

(٢) بڕوانە پەرتوکەکانی نوڕوالیەقینو محمد ڕەزاو قەستەلانیو تەفریجالنەلەق في تەفسیری سورە الفەلەق و ئوسدوالغابـە فی مەعریفەتی السەحابە ج/٤ ئەمان هەردووکیـان باوکیان ناوی حاریس بوو داییشیان نـاوی عەفراء بوو وەك لە پێشەوەتر باسکرا ٠

(د٠خ)
بۆ پەیغەمبــەرمان هاتــە خوار لــە ئاسمان
(د٠خ)
پەیغەمبــەر ووتیــــە گــــەلی هــــاوەرەکان

هــەر کەس بــۆ مەکەکــە بچێت لــە ئێــوە
لای ئەبو جەهل ئەالرالرەحمان بخوویێنێتەوە

لای خـــــوا پـــــاداشی پێ ئەدرێتـــــــەوە
عەبدواالالی مەسعودیش لەمکات هەستاوە
(د٠خ)
ووتی من ئــەچم ئــــەی ڕەســـــولی خــــوا
ڕۆیشت بــۆ مەکەکە تا چـــوە ماڵی خـــوا (١)

لــــەوێوەش هەنـــدێ گـــــاووری دیتن
ووتی بە ئەبــو جەهـــل بڵێن هاتـــنی من
(د٠خ)
من سورەتێـــــکم لای ڕەســـــــول واالاه
بۆ ئەم هێنــاوە بـــــۆی بخووێنمـــــەوە

گاوورەکانیش چوون بە ئەبو جەهلیان ووت
ئەبو جەهلی مەلعونیش لــەم کاتا وەك هات

ووتی ئەی کــوڕی مەســعود ئەتـــۆ چیت
مەبەستە بــــۆ منی بخــــووێنەوە خـــۆت

عەبدواالالی مەسعودیش چوە سەر حەتیم(٢)
ســــورەتی خووێنــدەوە کـــەلامی قەدیم

---

(١) واتا کابە ٠
(٢) واتا دیواری هۆدەی ئیسماعیل پەیغەمبەرە (د٠خ) لە تەك کابەیە ٠

وەك لە خووێنــدنەوەی ســورەتیش بــۆوە
ئەبو جەهــل چــوە پێش لێی نزیــك بــۆوە

گوێیی بە خووێن هینــا ڕای کێشا بە توند
(د٠خ)
بـــــە قســـــەش ووتی ئایـــــە محمـــــد

بەم سوڕەتەوە ســـــیحی لێتـــــان کـــرد
لە دواییش وابوو ئـــاوا کوڕی مەســـعود

بەرەو مەدینە لـــــە مەکەکـــــە گـــــەڕاوە
(د٠خ)
بـــــۆ لای پەیغەمبـــــەر بە زامداریـــــەوە

(د٠خ)
بەڵام لــە پێش ئـــــەم جوبـــــریلی ئەمـــین
(د٠خ)
لە لای پەیغەمبــەر پەیا بــــوو بــە خەنــین

بـــــاسی ڕوداوی ناوبـــــراو هەمـــــووی
بە پەیغەمبەر ووت بـــەم شـــێوەیە فەرمووی

ئەبو جەهــل گوێچــکی کــوڕی مەســعودی
زامدار کــرد بــەڵام لــە داهاتــــووی دیێ

لە جەنگی بـــــەدر کــوڕی مەســـــعود خۆی
ئەبو جەهل سەرئەبڕێت لە جیات مافی خۆی

(د٠خ)
کوڕی مەسعودیش لـــــە دوای جوبرائیـــــل
(د٠خ)
چوە لای پەیغەمبـــــەر دامـــــاوو مەلـــــول

(د٠خ)
سەروەری ئەمـــین لە گرژینـــا بـــوو
عەبدوالالای مەسعودیش لەم کاتا پێی ووتبو

(د٠خ)
ئەی ڕەسولی خـــوا ئایە بە بریـــنی٠٠٠
گوێچـــکی من ئەتـــۆ ئـــاوا ئەخـــەنی

پەیغەمبەر فەرمـــووی من خـــەنینی خۆم
ئەی کـــوڕی مەســـعود لەمـــەدوا پێت ئەڵێم

لـــە داهاتووشـــا وا ڕێـــك کەوتبـــوو
عەبدوالالای مەســـعودی خوالێخۆشـــبوو

ئامـــادەی جەنـــگی بـــەدر نەبـــوو بـــوو
لە دوایی‌شـــا وەك بۆ بـــەدر چـــوو بوو

جەنگ کوژابۆوە کۆتـــایی پێ هاتبـــوو
بۆ لای پەیغەمبەر (د٠خ) لەم کاتـــا چوو بوو

(د٠خ)
پێی ووتبوو ئـــەمن ئـــەی ڕەسولی خـــوا
پاداشی جەنگم لـــە نێـــو چـــوو فەوتـــا

لەم کاتا پەیغەمبەر دوورودی خـــوای لە سەر
ووتی‌یە عەبـــدوالالای ڕەزای خوای لەســـەر

شیرێك وەرگـــرە بـــۆ نێـــو کـــوژراوی
لەشـــکری دوژمن تـــۆ بچـــۆ ئـــەوی

حەیات‌و ژیـــانی ٠٠٠ لەبـــەر دامـــابێ
بی‌کوژە پـــاداشی شـــەهیدیت ئـــەبێ

عەبدوالالای مەسعودیش ڕەزای خوای لەسەر
بۆ نێـو کوژراوان دەرچوو دەست بـە شیر

چوو لە نێـــو گەڕا بـــە چـــاوڕوانی
ئەبو جەهلی دیتـــەوە کز ببـــوو ژیـــانی

بە زامداریـەوەش هـــەر ئەمەتـــە مابوو
هـــەردوو دەســـتیشی لەبن بـــڕا بـــوو

عەبدوالالای مەسعودیش پـای لە مڵ نابوو
ڕیش و ڕدێـــنی تونـــد ڕاکێشـــابوو

لە دواییش پێی ووتبـوو ئەی دوژمنی خوا
باووڕیت دەربـــڕە شـــەرم کە لە خـــوا

هەتاکو بمـــریت بـــە باووڕیتـــەوە
بچێیتە نێـو بەهـەشت لـە دوا ڕۆژتەوە

ئەبو جەهلی مەلعـــونیش لـــە وەڵام ووتی
ئەی کـــوڕی مەســـعود ئەمن لـــە کاتی

مـــان و ژیـــانم بـــاووڕیم نەهێنـــاوە
چوون بـاووڕی ئەهێنـــم لە مردنمـــەوە

گـــەورەی گـــەلێ کیش بـــە دەست گەلەکەی
گەر هاتـــوو کـــوژرا نـــاچێت ئابـــڕووەکەی

تۆ خەبـــەر بـــدە محمـــدی هـــاوڕێت
ڕقم لـــە ئەمـــە لە حەیـــات و مەمـــات

عەبدوالالای مەسعودیش ڕەزای خوای لەسەر
سەر و ملی پەل دا لەوێیی کرد بێسەر (١)

ویستی سەرکەکەی هەلگرێت نەیتانی
گوێچکەکی کون کرد تێی یەخست بەنێ

لە دوای خۆی کێشا بۆ لای پەیغەمبەر
لەم کاتا جوبریلیش سلاوی خوای لە سەر

دەم بە پێکەنین لە ئاسمان هاتە خوار
دابەزی چوە لای سەروەری موختار

جوبڕائیل ووتی ئەی ڕەسولی خوا
گوێچك بە گوێچك سەرکێش زیاد برا

پەیغەمبەریش لەم کاتا دورودی خوای لەسەر
وەك عەبدوالالای دیت ڕائەکێشت سەر

ووتی ئەی کوڕی مەسعود ئەمە بوو
هۆی خەنینم لەم کات لە مەکەکە هاتیەوە تۆ

چونکە جوبرائیل سلاوی خوای لە سەر
پێی ووتبووم لە پێش ڕوداوی بەدر

(١) بڕوانە تەفسیری نیسابۆریو پەرتوکەکانی نوڕولیەقینو موحەممەد ڕەزا و ئوسدولغابە بەرگی/٣ .

## (باسی چۆونیەتی گواستنەوەی لاشەی موشریکەکان)
## (لە گۆڕەپانی جەنگ بۆ نێو بیری بەدر لە دوای شەڕ)
## (وەســـــتان)

(د٠خ)
لەم کاتا پەیغەمبەر(١) دورودی خوای لەسەر
فەرمانی دەربـــڕی دوای کۆتـــایی شـــەڕ

بـــە گۆزیینـــەوەی لاشــــەی موشریکان
لە شوێن کـــوژراویان لە گۆشەی مـــەیدان

بۆ بیری بەدریـــان ببـــەن هەموویـــان
(د٠خ)
بیانهاوێنە نێـــو چونـــکە پەیغەمبەرمـــان

عادەتی وابـــوو لـــە گشت جەنگـــەکان
گەر تێپـــەڕ ببا بـــە لاشەی ئینســـان

فەرمانی دەرئەبـــڕی بنێژرێت لـــەم مەکان
نەشی ئەپـــرسی ئیســـلامە گاوورە یـــان

وابوو دەست بـــەجێش گشت لاشـــەکانیان
هاوێشتنە نێو بیر خۆلیـــان کردنە سەریان
(د٠خ)
لـــە دوای سێ ڕۆژان بە شـــەو پەیغەمبـــەر
لەگـــــەڵ هاوڕانی چـــۆوە بۆ بـــــەدر

لەسەر بـــیر ووتی ئەی ئـــەهلی نێـــو بیر

ئێوە بوون بەدی نەتـــەوەی پەیغـــەمبەر

---

(١) بروانە پەرتوکەکانی محمد ڕەزاو نورواليەقین/لاپەڕە/١١٦ .

(د٠خ)

من پەیغەمبەرتان بــووم بە درۆتــان زانیم
عالەم و خەڵکی‌یش بـــە ڕاستیان زانیـــم

ئەی ئومەیەیەی خەلەفو ئەی عوتبەی ڕەبیعە
ئەی ئەبو جەهل و ٠٠٠ ئەی شەیبەی ڕەبیعە

ئایە ئێــوە گشت ڕێككەوتــووتان بـــوو
بۆ ئەم شتەی خوای ئێوە بە ئێوەی بەڵێن دابوو

من ڕێككەوتووم بوو بۆ ئەم شتەی خوای من
بـــــە مــــاق و ڕەوا بلێنی دابـــــوە من

ئیمامی عومــەریش ڕەزای خــوای لە ســەر
ووتیە پەیغەمبــەر دورودی خوای لە ســەر

چوۆن قسە ئەكــرێت ئــەی نەبی یــەزدان
لەگەڵ چەند لاشــەیێ تیایان نــەبێت گیان

(د٠خ)

پەیغەمبــەر فەرمـــووی ئێــوە لــە ئــەوان
بە گوێی‌گرتر نــین بـــۆ ئەم قســـەی من

ئەڵێمـــە ئـــەوان بـــــەلام ناتــــوانن
وەلامەدەنــەوە بـــــە قســـــە كـــــردن

ئەمجا پەیغەمبــەر دورودی خــوای لە ســەر
لە دوا كۆتایی ئــەم جەنـــگەی بـــــەدر

بە بۆنەی سەركەوتن لە ســەر موشری‌كان
مزگێنی هەنـــارد بـــۆ دێی‌و شـــارەكان

عەبدوالالای کوڕی ئـەبی ڕەوواحـەی
نارد بۆ دانیشتووانی ئـەهلی عالیەیەی(۱)

بۆ سـافیلەش زەیـدی کـوڕی حاریسەی
بە سواری هەنارد بە ووشترەکەی(۲) خۆی

لەم کاتیشا جولـەکە و مونافیقـەکان
وەك نیـزامی دوژمن لـە بەلاوەی زیـان

درۆیان لـە دژی سـوپای ئیسـلامەمان
بەلاو کردبـۆوە لـە دێی و شـارەکان

عەبدوالالای ڕەوواحە و زەیـدی حاریسەش
وەك چوونە مەدینـە ئـەهلی مەدینـەش

شادبوون لە خۆشیان بـەلام هەمووشیان
لە چوونـەوە بـوون لـە سەر گۆڕسـتان

لـە دوا شاردنـەوەی کچی سـەروەرمان
ڕوقیەی خێـزانی عوسـمانی عەفافـان

---

(۱) شوێنێکە لە نزیك شاری پەیغەمبەر (د٠خ) ٠

(۲) واتا ووشتری پەیغەمبەر (د٠خ) ٠

**(باسی چۆنیەتی دەرچوونی منـالانی مەدینەی بە دەف و)**
**(سورود ووتن بـــۆ پێشوازی کردنی پەیغەمبـــەر و)**
**(هاوەڵان بە بۆنەی هاتنەوەیان لە جەنگی بەدر لە ڕێگای)**
**(سەنیتالوداع)**

لە سەنیاتولوەداعی(٢) گەشا مانگی چواردەمان
سوپاسی خوا لە سەرمان واجبە بە تێکڕاییمان

بە بۆنـــەی سەرکەوتنمان لەســـەر هاوبەشیەکان
شێوەی بەردەوامیشمان لەسوپاس کردنی خوامان

تا مانی تاکێ لە جیهان تکاکار بێت لە یەزدان
ئەی نێردراوی لە خۆمان بە فەرمان لەلای یەزدان

(د٠خ)

هاتوویت بە پەیغەمبەرمان واجبیشە بۆ گشمان
فەرمـــان بەربـــین بـــۆ یـــەزدان

**(باسی چۆنیەتی گەڕانەوەی پەیغەمبەر (د٠خ)و هاوەڵانی)**
**(ئەم لە جەنگی بەدر بۆ شاری مەدینـــەی پیرۆزو دابەش)**
**(کردنی غەنیمەتو تالان بەسەر خاوەن بەشەکان)**

وەك پەیغەمبەریش دورودی خـــوای لەسەر
گەڕاوە مەدینە ٠٠٠ لـــە جەنـــــگی بەدر

---

(١) بڕوانە پەرتوکی نورولیەقین/لاپەڕە/١١٧ ٠

(١) ڕێگای بەدرە لە چیایێ ئەهێنـــەخوار بۆ نێو شاری پەیغەمبـــەر (د٠خ) واتا مەدینەی پیرۆز ٠

له نێوان هه‌نـــدێ لـــه هـــاووڕه‌كان
له موهاجــیران و (١) له ئه‌نساریه‌كان(٢)

له جه‌نــگاوه‌ری پــیر و گه‌نجــه‌كان
نارێكیــه‌ك ڕویدا لــه دابــه‌شی تــالان

بــۆ برانـــه‌وه‌ی نـــارێكیه‌كه‌شیان
به‌زه‌یی پێ كـــردن خودای میهره‌بـــان

نارديه خوار له ئاســمان به‌هۆی جوبــڕائیل
(د٠خ)
بۆ په‌یغه‌مبـــه‌رمان ســـوره‌تی ئه‌نفـــال

دڵیــان گه‌شــاوه به نــوری قورئـــان
نارێكیـــان نه‌ما بـــوه خۆشـــیان

وابـــوو تێكڕایـــان تالانه‌كه‌شـــیان
(د٠خ)
به په‌یغه‌مبه‌ردا بـــه نیازی دابه‌شـــان

په‌یغه‌مبه‌ریش وه‌ك یه‌ك به حوكمی قورئان
دابه‌شی كـــرده سه‌ر خـــاوه‌ن به‌شـــان

پیاده‌وو پیاده‌ی له‌گـــه‌ڵ یـــه‌ك بـــه‌شدا
به‌شی سواریشی له‌گـــه‌ڵ ســـوارانداا

به‌ڵام پیـــاده‌شی به یـــه‌ك بـــه‌ش دانا
به‌شی ســـواریشی بـــه سێ بـــه‌ش دانا

---

(١) له دانیشتووانی مه‌ككه‌ی پیرۆز بوون ٠

(٢) له دانیشتووانی شاری په‌یغه‌مبه‌ر بوون (د٠خ) ٠

له ئاماده نه‌بوانی بـــه‌دریش هه‌ندێـــکی
بـــه‌شدان له‌مانـــه‌ی وابوو هــــه‌ر یه‌کی

له سه‌ر کارێـــکی پێـــویست دانابـــوو
ناوه‌کانی‌شـــیان بـــه‌م شـــێوه‌یه بوو

حاریسی کـــوڕی حاتـــه‌بی بـــه جێگـــر
دانابوو له‌ســـه‌ر بـــه‌ره ماڵی عه‌مـــر

ئه‌بو لوبابـــه‌شی(١) دانابـــوو به جێگـــر
له‌سه‌ر مه‌دینـــه ڕه‌زای خـــوای له سه‌ر

ئه‌خواتی جوبه‌یر و حـــاریسی ســـه‌مته‌ش
گه‌ڕانه‌وه له ڕه‌وحـــاء بـــه‌وانیشی دا بـــه‌ش

چونکه له ڕێـــگا ئـــه‌وان هه‌ردوکیـــان
پایان شـــکابوو له نێـــوان بـــه‌ردان

ته‌لحه‌ی عوبه‌یدوالالاو سه‌عیدی(٢) به‌جاسوس
ناردبـــوه لای دوژمن بـــۆ هێنانـــه‌وه‌ی باس

بۆ ئـــه‌هلی قوبأ و ئـــه‌هلی عالیـــه‌ش
عاسی دانابـــوو لـــه ســـه‌ر کارو ئیش

هه‌ر چوارده شـــه‌هیدی به‌دریشی وه‌ك ئه‌وان
هه‌موو بـــه‌شدار کرد بـــه‌شی بۆ دانـــان

---

(١) له دانیشتووانی مه‌دینه‌ی پیرۆز بوو .

(٢) کوڕی زه‌ید بوو .

(د٠خ)

لەبەر نســـاغی ڕوقیـــەش پەیغـــەمبەر
ئیمـامی عوســـمانی نەبردبـــوە بەدر

## (باسی چۆنیەتی دانەوەی دیلەکانی قوڕەیشیان)
## (لای سوپای ئیسلام بە پارەو نـرخی پارە لێسەندنیان)

لەم کاتا پەیغەمبەر دورودی خـوای لەسەر
وەك بۆ مەدینـــە گـــەڕاوە لە بـــەدر(١)

لـــە دەربـــارەی کاری دیلـــەکان
موشاوەرەی کـــرد لەگەڵ هـــاووڕەکان

ئیمامی عومـــەر ڕەزای خـــوای لەســـەر
(د٠خ)
ڕای خۆی دەربـــڕی ووتیە پەیغەمبـــەر

(د٠خ)
ئەی ڕەســـولی خوا ئـــەوان ئەتۆیـــان
بـــە درۆزن زانی ئەوانیش بون تۆیـــان

لە مەکەکە دەرکرد جەنگیان کرد لـە دژی تۆ
بـــە ڕای من وایـــە دیلت نەبێ تـــۆ

لە ملیـــان بدە فـــولانی خزمیشـــم
بدە دەســـتە من خۆم لـــە ملی ئـەدەم

عەباباسیش بـدە دەست حەمـزەی بـرای
عەقیلیش بـــدە دەست عـەلی بـــرای

---

(١) بروانە پەرتوکەکانی محمد ڕەزاو نوڕوالیەقین/لاپەڕە/١١٩ ٠

تا خەڵــك بــزانن ئێمـــە لە دڵمـــان
دانیە خــۆشویستن لەگـــەڵ موشریکان

عەبدوالالای ڕەوواحــە و ســەعدی مەعازی
ڕایان لەســـەردا خوا لێیـــان بێت ڕازی

لە دوای ئەوانیش ئیمـــامی ئەبـــو بەکر
ڕای خۆی دەربــڕی ڕەزای خــوای لە ســەر

(دەخ)

ووتیە پەیغەمبــەر ئەی ڕەســـولی مەنانان
خزم و گەلی تـــۆن ئەمانـــە هەمـــوویان

خوا ســەرکەوتنی تۆی دا لەســـەر گشتیان
ڕای من ئەمەیـــــە ئەتـــۆش تێکـــڕایان

بەێڵی تـــەوە لە ســـەریان نـــەدەی
پارەیان لێ وەرگــریت لە جیــاتی فیدیــەی

لەم کاتا ئەمـــەی وەرمـــان گرت لـــەوان
ئەبێتە هێز بۆمـــان لەســـەر گاووران

نزیکیشە خـــوا ئەوان بەهـــۆی تـــۆ
هیدایەت بـــدات ببنـــە هێـــز بۆ تۆ

لەدواییش پەیغەمبەر دورودی خوای لەسەر
ڕای خۆی دەربڕی لەســەر ڕای ئەبو بەکر

لە پاشان ووتیـــە هاوڕەکانی خـــۆی
ئێوە هـــەژارن با کـــەس دیلی خــۆی

بەر نەدات ئیمڕۆ بە پارە نەبی
وەك گەیشتە مەكەكەش ئەم باسەی نەبی

لە نێو قوڕەیشیان بوە شین و گریان
مانگێ شینیان كرد لە حەزمەت كوژراویان

وابوو لە دواییش بە ڕای گەورەكان
كڕكرانەوە لە شین و گریان

بە بۆنەی ئەمە تا ئەستێننەوە
مافی كوژراویان لە ئیسلامەوە

بۆ ئەمەش نەبادا باسی گریەو شین
(د٠خ)
بە پەیغەمبەر و هاوڕان بگات پێخۆش بن

بۆ داوا كردنەوەی دیلەكانیشیان
لە سوپای ئیسلام دەربارەی بەردان

لە نێوان خۆیان بڕیاریان وادا
كە پەلە نەكەن بۆ ئەی نەبادا

موسوڵمانەكان نرخی دیلەكان
لەسەریان گرانكەن لە كاتی پارەدان

گوێی نەدا ڕاكەش پێشەكی هەموویان
موتەللیبی وەدداعەی لە نەوەی سەهمیان

باوكی دیل كرابوو بۆ كڕینەوەی
چوە مەدینە بە دزی لە مەكەكەی

باوکی کڕیەوە بە پارە بەڵام
بە نرخ و ژمارەی چوار هەزار درهەم

وابوو لەم کاتیش وەك قورەیشیەکان
زانیان ناردیان بۆ دوای دیلەکان

ئاوا گەر دیلێ ماڵی هەبا دەبا
چوار هەزار درهەم پارەی بدابا

ئەم ئیسلامەکەی هەر کە لە کاتی
جەنگ لە مەیدانا بە دیل گرتیتی

ئەگەر دیلێکیش ماڵی نەبوایە
نوسین و خوێندنەوەی بزانیبایە

لە جیاتی پار ئەویش دەبایە
دە منالی مەدینەی تەعلیم دابایە

ئەمەش بۆ وابوو چونکە دانیشتوانی
مەکەکە نوسین و خوێندنەوەیان ئەزانی

بەڵام مەدینەییش بەر لە کۆچەوە
نەیانئەزانی نە بنوسن نە بشخوێننەوە

عەمری ئەبی سەفیانیش لە دیلەکان بوو (١)
بۆ هێنانەوەی بە باوکی ووترابوو (٢)

---

(١) بڕوانە پەرتوکی نورواليەقين ، لاپەڕە/١٣٠ .

(٢) ئەمانەی پێیان وتبوو عەبدوالای کوڕی ئەبی ڕەبیعەو عەکرمەی کوڕی ئەبی جەهلو سەفوانی کوڕی ئومەیەیەی بوون ، بڕوانە تەفسیری خازین ، بەرگی /٢/لاپەڕە/١٩٢ .

باوکیشی لەم کاتــا قەدەغـــــە ببـــوو
بەم شــێوەیە سووندی بە خــوا خواردبوو

وەالالاهی نـــــــابێت کۆبکاتـــەوە
محمد لە نێـــوان کـــورِ و ماڵـــەوە

لە دواییـیـــا ووتی ئێـــوە لێی گەرِێن
با لە دەستیان بێت هــەرچی لێی ئــەکەن

دوا بــە دوای ئەمـــەش خوالێخۆشـــبوو
سەعدی نوعمـانی بۆ مـــەکەکە چووبوو

بە نیازی عەمـــرە واش رِێك کەوتبـــوو
لەوێش ئەبی ســەفیان ســەعدی دیتبــوو

لە جیات عەمــری کورِی بەنـدی کردبــوو
وابوو باسەکەش وەك بۆ مەدینە چوو بوو

خزم و گـــەلی ســـەعد هەمــوو لــە هەمور
(د٠خ)
بۆ لای پەیغەمبەر چووبوون پێیان ووتبوو

پەیغەمبەریش لەم کاتا دورودی خوای لەسەر
عەمری دانێ بە ئــەم سەعدیان کرد رِزگار

(د٠خ)
ئەبوالعاسی رِەبیــعی (١) زاوای پەیغەمبەر
(د٠خ)
شـــوی زەینـــــەبی کچی پەیغەمبــــەر

---

(١) بروانە پەرتوکی نورِوالیەقین/لاپەرە/١٢٠ ٠

دیـل کرابـــوو ئـــەویش وابـــوو زانی
گەردن لغێـکی ٠٠ نـارد بـۆ بەردانی

گەردن لغـــەکەش خەدیجـە خـــانی (٢)
دایکی پێی دابـــــوو شەوی بــــوکێنی

وەك چـاوی پێکەوت لەم کاتـا پەیغەمبەر
بەزەیی بەزەینەبهات دورودیخوایلەسەر

بە هـاووڕانی ووت گـەر ڕاو لەسـەر بێ
دیلەکەی بـــەردەن لـــە بۆ زێنـــەبێ

گـەردەن لغیشی بـــۆ ڕەت کەنــــەوە
ئـەوانیش ڕازی بوون بـە قسەی ئەمەوە

وابوو پەیغەمبــەر (د٠خ) ئەمجا لـەم کاتا
ئەبوالعاسی ڕەبیعی لـــە دیلی بـــەردا

بەلام بە مـــەرجێ کە ئەبوالعـاس چۆوە
زەینەب بۆ مەدینــــە ڕەوان کاتـــەوە

وەك ئەبوالعاسیش بـــۆ مەکەکە چـــۆوە
بە زەینەبی ووت بـۆ لای بـاوکت بچـۆوە

**(د٠خ)**

پەیغەمبەریش یەکی نارد بۆ دوای زێنەبێ
ئەویش وەك چووبوو لە مەکەکە زێنەبی

---

**(٢) واتا دایکی ئەمو ئیماندارانو خێزانی پەیغەمبەر بوو کچی خویلید بووو**

بردبۆوە مەدینـە جـــگە لەم قســـەش
لە شیر حەڵاڵ و خۆیی بوو ئەم یەکەش(١)

وەك ئەبوالعاسیش ئیســلام بوو لە پێش
جەنگی مەکـەکەوە (د•خ) ئـاوا پەیغەمبـەریش

بە مارە کردنی هــەوەل بێ مارە کردنـەوە
زێنـــەبی کچی بـــە ئەبوالعـــاس داوە

سوهەیلی (٢) عەمریش لـە دیلـەکان بوو
لـــە دوان دەرانی قورەیشـــیان بـــوو

زۆر جار لــە دژی ئیســـــلام دوابـــوو
بە زوبـــان ئـــازاری ئیســـلامی دابوو

ئیمامی عومـەریش ڕەزای خوای لـە سەر
ووتیە پەیغەمبەر دوورودی خـوای لە سەر

ئەی ڕەســـولی خـــوا (د•خ) لێم‌گەڕێ تـــا من
هـــەردو ددانی ســـوهەیلی لـــە بن

دەرهێنم لـــــە زار زوبانی بچتـــــە دەر
تا هەتایە لە دژت هەرنەستیت بە دوان دەر

---

(١) زەیدی کوڕی حاریس بوو لە نەوەی کەلب بوو لە کاتی نەزانین دیل‌کرابوو حەکیمی کوڕی حیزامی بۆ خەدیجـەی پلکی کڕیبوو پەیغەمبەریش (د•خ) لە خەدیجە داواکردبـوو ئـەویش دابـوی بە پەیغەمبـەر (د•خ) بـڕوانە قەستەلانی ، ج/٧/لاپەڕە/٣٧٥ •

(٢) بڕوانە پەرتوکەکانی نوروالیەقینو دایکیشی ناوی بەیزا بوو ، خازن ج/٢ لاپەڕە/٢٠٦ •

پەیغەمبەریش لەم کاتا دورودی خوای لەسەر
لە وەڵاما ووتیــە ئیمـــامی عومـــەر

من سەزا بـۆ خـــۆم وەرناگرمــــەوە
پەیغەمبەریش بم خـوا لێم وەرئەگریتەوە

نزیکە سوهەیلیش لــــە شوێنێکــەوە
زەم نەکرێت بــە دواندەر هەڵستێتــەوە

موکرزی حەفسیش گیـانی خۆی لــە جیات
سوهەیلی بەنــد کرد تـا پـارەی بـۆ هات

وەك پارەی بۆ هات خـــۆی کڕی‌یــەوە
موکرزیـان بــەردا سوهــەیلیش چـۆوە

(د٠خ)

ئەم باسەی(١) پەیغەمبەریش خوای میهرەبان

(د٠خ)

لە دوا کۆچ کـردنی پەیغەمبەر لــە جیهان

بەهۆی سوهەیلی لــــە نێو قورەیشــــیان
گەیاندە جێ لــە کاتێ وەك مەکەکەیی‌یەکان

ویســـتیان تێکڕایـــان ببنــــەوە گاوور
وابوو سوهەیلیش هەســتاوە بە دواندەر

دوانێــــــکی دا لــــە دوانەکەشــــا
سوپاسی خوای کــرد لە دوای ئەمەشــا

---

(١) بڕوانە پەرتوکی نوروالیەقین/لاپەڕە/١٢١ ٠

دورودی خوای لێدا لەســـەر خۆشەویست
بەم شێوەیە ئـــاوا بە خەڵـــکەکەی ووت

(د٠خ)
ئەم کـــەسی دەیکـــرد پەرســـتی محمد
محمد ئـــەوا مرد کـــۆچی دوایی کـــرد

بـــەڵام هەرکەســـیش لە ڕابـــردودا(١)
خوای ئەپـــەرست نامـــرێتن خـــودا

ئایـــە نـــاشزانن فەرمـــانی یـــەزدان
( انـــك میت ٠٠ وانهـــم میتـــون )(٢)

لـــە دواییش ســـوهەیل ووتی وەاڵاهی
ئەمن ئەزانـــم ئەم ئـــایینە لـــە دوایی

درێـــژەی پێ ئـــەدرێت بە درێـــژایی
تریســـکە دانی ڕۆژ تـــا جـــاری دوایی

بە قسەی ئەبیسەفیانیش هەر مەخەڵەتێن
چونـــکە لـــەم کارە ئـــەویش وەکی من

ئەزانێت بـــەڵام مۆر بـــوە لە ســـینگی
چاوێنی بـــردنی نـــەوەی هاشـــیمی

لەسەر خوای خۆشـــتان تەوەکوکولو هەبی
ئەم ئایینـــەی خـــواش بـــەردەوام ئەبی

---

(١) بڕوانە پەرتوکی نوڕوالیەقین/لاپەڕە/١٢٢ ٠

(٢) ئایەتی ژمارە ٣٠/ لە سورەی زومەر ٠

قسەو ووشەی خـواش گشتی تـەواو بوە
خواش سـەری ئەخا ئەمەی سـەرکەوتوە

خـواش ئێـوەی لەگـەڵ چاکتـرینی ئێوە
کـــە ئەبوبەکـــرە کۆکردیتــــەوە

ئەمجا چـــاك وایە هـــەرکەسی دیتمـــان
چوو بۆوە کافر لـــە ملیدەین گشــتمان

بـــەم کارەش ئـــاوا لە نێـــوان عالـــەم
پێ بەهێـــز ئـەبێت ئـــایینی ئیســـلام

لە دوا کۆتایی دوانـەکەی ســـوهەیلیش
وابوو دانێشـــتوانی مەکەکەی پـیرۆزیش

لـــە نیازەکەیـــان گشت گەڕانـــەوە
بۆ ســـەر ئـــایینی ئیسلامیەتـــەوە

ئەم دەنگ و باسەش بێگومان یەکێك بوو
لە موعجیزاتی خۆشــــەویستمان بـــوو

هیشامو خالیدیش وابوو (١) هەردووکیان
لە بەدریـان دیلکـــرد وەلیدی برایـــان

ئەویش پـــارەی دا خۆی کڕییـــەوە
بەردرا بـــۆ مەکەکـــە چوو گەڕایـــەوە

وەك گەیشتە مەکەکەش لەمکاتا ئیسلامبوو
وابـوو لـەم ئەسـناش پێیـان ووتبـوو

---

(١) بڕوانە پەرتوکی نورو الیەقین/لاپەڕە/١٢٢ ٠

بۆچ ئیسـلام نەبویت ئەتـۆ لـە کاتی
پـارەدان ئـەویش لـە وەڵام وتی

مەترسـیم هەبـوو نەبـادا ئـەوان
ئیسلام بـوونی من بژمێرن لـە ترسان

وەك بە تەماش بـوو لە مەکەکە بـارکا
برایـەکانی ۰۰۰ لێ نەگەڕان بـار کا

(د۰خ)
لـە عەمرەی قـەزا بۆ لای پەیغـەمبەر
ڕای کرد لە مەکەکە چـوو خۆی کرد ڕزگار

سائیبی یەزیدیش(۱) لـە دیلـەکان بـوو
باباى پێنجەمی ئیمـامی شـافیعی بوو

لە بەدر ئاڵا هەڵگـری موشریکـەکان بوو
پارەی خـۆشیدا لـە دیلیش بەربـوو

وەهەبی کـوڕی (۲) عومەیـری جەمحیش
لە دیلەکانی بـەدر بـوو ئـەویش

عومەیری بـاوکی چۆن شـەیتانێ بوو
لە شـەیتانانی قوڕەیشـیان بـوو
(د۰خ)
زۆریش ئـازاری پەیغەمبـەری دابـوو
دوا بە دوای بـەدریش ئـاوا ڕوی دابـوو

(۱) لە جەنگی بەدر ئیسـلام بوو کندی بوو بڕوانە پەرتوکی ئوسـدوالغابە ، ج/۲ ۰

(۲) بڕوانە پەرتوکی نوڕوالیەقین/لاپەڕە/۱۲۲ ۰

عومـــەیر لەگـــەڵ ســـەفوانی ئومەیـــەیەی
بە یەکەوە دانیشتبوون لـــە هۆدەی کابەی

باسی زیـــــانی بەدریـــــان ئەکـــــرد
لە قسەو ووتووێژ عومـــەیر سوندی خوارد

ووتی وەالالاهی گـــــەر قـــــەردار نەبـــام
نیشە بدەمـــــەوە لـــــە ســـــامانی خـــۆم

لەبەر مەترسیش لـــە هـــــەژاری منـــــاڵم
لە دوامـــــا دەبـــــا من خـــۆم بچووبـــــام
(د٠خ)
بـــــۆ لای محمـــــــد بمکوشـــــــتبایە
چونکە کـــورِم دیلـــە لـــە دەست وان دایـــە

ســـەفوانیش ووتی قـــەرزت لەســــــەر من
منـــــاڵیشت گشت لەگـــــەڵ منـــــاڵی من

لەم کاتا عومەیـــریش شـــیری دەست دایێ
بەرەو مەدینـــــە ڕۆیشت تـــــا چـــوە وییێ

ئیمـــــــامی عومـــــەری خوالێخۆشـــــبوو
لەگەڵ هەندێ ئیسلام لـــەویێ وەستابوو

وەك عومـــــەیری دیت کە شــــیری لایـــــە
ووتی ئـــــــەم ســــەگە دوژمنی خوایـــــە

بە چاکە نەهاتیە بـــەس هاتیـــە بـــۆ شـــەڕ
(د٠خ)
زوو غاریدا چـــــوو ووتیە پەیغەمبـــــەر

(د٠خ)

ئـەی ڕەســولی خــوا ئەمە عومەیــرە
دوژمنی خوایـــــە هاتیتـــە ئێــرە

لەم کاتا پەیغەمبەر دورودی خــوای لە سەر
ووتی ئەی عومــەر بۆ لای منی بهێنــە ژۆر

ئیمامی عومــەریش ڕەزای خوای لــە سەر
حەمایل شــیری گرت عومەیــری بردە ژۆر

وەك پەیغەمبەریش دورودی خوای لە سەر
عومەیری دیت ووتی بــەری‌دە ئەی عومــەر

ئەی عومەیر ئەتــۆش لێم نزیــك بەوە
عومەیریش چــوە لای لێی نزیــك بۆوە

لە جیات ســلاو ووتی ئەنعیمو ســـەباحا
بەیانی‌تان بــــاش ئێــوە تێکـــڕاتان

لەم کاتا پەیغەمبــەر ووتیە عومـــەیری
خــوا سلاوێــکی بــۆ ئێمـــە گــۆڕی

بە چاکترین ســــلاو لە ســلاوی تــۆ
ئەویش سەلامە لـــە دوایی‌یا ووتی تــۆ

بەهۆی چی‌تـــەوە هاتی ئـــەی عومـــەر
(د٠خ)
عومەیریش لــە وەڵام ووتیــە پەیغــەمبەر

هاتنی من لەبـــەر ئــەم ئەســـیرەیە
کە دیلـــە ئێستا لـــە دەست ئێوەیـــە

جا بۆیــــه ئـــەمن هاتـــم بۆ لاتــــان
بۆ ئەمــەی ئێوه چـــاکەی لەگەڵا بــکەن

(د٠غ)

پەیغەمبەریش ووتی ئەی بـۆچ شیرت لایه
عومەیری جەمــحیش لــه وەڵام ووتی ئایــه

شیر بە کەڵــك چ شــتێکی ئێمــەوه هاتن
خودا گشت شــــیران له نــــاو ببــــاتن

لەم کاتەشا پەیغەمبەر دورودی خوای لەسەر
ووتی تــۆ ڕاســتیم پێ بڵێ ئــەی عومەیر

بۆچ هاتیــه ئێــره هەمیســـان ووتی خــۆم
بەس بـــۆ مەسەلەی کـــوڕەکەم هاتووم

پەیغەمبەر فەرمووی دورودی خوای لەسەر
وانیه تــۆ لەگەڵ ســـەفوان له حیجــر(١)

به یەکەوه دانیشتبوون ئەوهاو ئەوهاو گۆ
عومەیریش لــەم کاتــا خێرا ئیســلام بوو

لــه دوایی‌یــــا ووتی لـــــه ڕابردومـــان
ئێمه له بـــــاس و خەبـــەری ئاســـمان

که بـۆت ئەهاتــه خــوار وەحی و قــوڕئان
تۆمــان بــه درۆزن ئـــەزانی لای خۆمــان

ئەمەش کاریێ بــوو کــەس لــەم کارەمان
ئاگادار نەبـــوو بەس ئەمن و ســـەفوان

---

(١) ئەویش وەك حەتیم هۆدەی کابەیه له ڕوی باکورەوەیه ٠

(د.خ)
پەیغەمبەریش لـەم کاتا وو تیـە هاوورِان
ئێـــوە ئایینی خـــۆی بڵێنـــە براتـــان

قورئانیش بخویننـــەوە لـــە بۆ عومەیـــری
بەریش‌دەن ئێـــوە بـــۆ ئەم ئەســـیری

واش‌بـــوو هـــاوورەکان بـــە پێی فەرمانی
(د.خ)
پەیغەمبەر وهەبیان بـەردا بـۆ عومـەیری

لەم کاتـــا عومـــەیریش بـــۆ مـــەکەکە چۆوە
ئیسلام بـــوونی خۆی بـــەڵاو کـــردەوە

مەسەلەی عومەیریش بێ‌گومـــان یەکێ بوو
(د.خ)
لـــــە موعجیـــزاتی پەیغەمبەرمـــان بوو

ئەبوالعەزیزی(١) کـــــوڕی عومەیـــــری
برای مەســـــعەبی کـــوڕی عومـــەیری

ئەویش گـیرابوو لـــە دیلـــەکان بـــوو
مەسعەبی بـــرای بـــەلای تێ‌پەڕ بـــوو

بەم کەسی ووتبـــوو کـــە دیلی کردبـــوو
دەستی خۆت تونـــدکە ڕای‌گوشە ئەتـــۆ

دایکی ئـــەم خـــاوەن ماڵ و پارەیـــــە
ئەی کرِێی‌تەوە بـــە چەنـــدی هەیـــە

(١) بڕوانە پەرتوکی نوروالیەقین/لاپەرە/١٢٣ .

ئەبولعەزیزیش ووتی ئەی برام
ئامۆژگاری تۆ ئەمەیە لەلام

لە دوابیش دایکی بۆ کڕینەوەی
چوار هەزار درهەم پارەی نارد لە بۆی

ئیمامی عەباباسی خوا لێخۆشبوو (١)
لە جەنگی بەدر ئەویش دیل کرابوو

بەڵام بۆ جەنگیش ئەم بە زۆر چوو بوو
خزم و گەلی خۆی ناچاریان کردبوو

بە دیل کرایی‌یش دەستی بەسرابوو
(د.خ)
پەیغەمبەر لەمشەوە نەنوستبوو هەشیاربوو

لە هاوڕانی خۆی یەکێ پێی ووتبوو

ئەی ڕەسولی خوا بۆچ هەشیار بویت تۆ

پەیغەمبەریش فەرمووی لە وەڵامی پسیار
من لەبەر ناڵەی عەباباس بوم هەشیار

لە دوایی‌یا پەیغەمبەر بە پیاوەکەی ووت
بۆچ گوێی‌یم لە ناڵەی عەباباسی نابێت

---

(١) بڕوانە پەرتوکەکانی محمد ڕەزاو نوڕوالیەقین ئەمەی ئیمامی عەبباسیشی دیل کردبوو ئەبوالیوسر کەعب کوڕی عەمری ئەنساری بوو ، بڕوانە تەفسیری خازین ج/٣/لاپەڕە/١٨٢ .

پیاوەکـــەش ووتی ئـــەمن کردمـــەوە

(د٠خ)

پەیغەمبەر فەرمـــووی دیلان گشت بـــکەوە

وابوو پیاوەکەش بـــە قسەی ئەمـــەوە

چوو دیلـــەکانی هەمـــوو کردنـــەوە

ئیمامی عەبابـاسیش ڕەزای خوای لە سەر

(د٠خ)

وەك دەستی کـراوە چـوە لای پەیغەمبـەر

(د٠خ)

پەیغەمبەر فەرمووی ئەی عەبا باس تۆ خۆت

لە جیاتە خـۆت و هـەردوو بـرازای خۆت

نەوفەل و(١) عەقیل و(٢) سوند خۆرەکەی خۆت

سەت وەقە بـــدە لە ســـامانی خـــۆت

ئیمامی عەبا باسیش ڕەزای خـوای لە سەر

(د٠خ)

ئاوا بـەم قســـــە ووتیە پەیغـــــەمبەر

لەسەر چی ئێمـــــە پارەمـــان بـــدەین

بە زۆریش ئێمە کە بۆ جــەنگ هاتووین

(د٠خ)

لـە وەڵامی عەبا باس پەیغەمبـەر فەرمووی

بە زاهیر ئەتـــۆ لە زیـــان ئێمە بـــووی

---

(١) کوڕی حاریسی کوڕی عەبدوالموتەللیب بوو ٠

(٢) کوڕی ئەبوتالیب بوو ٠

پارەکەی ئێسەند لــە جیاتی فیــدیەی
گیانی خۆیو هــەردو بــرازای خــۆی

ئیمامی عەباباسیش ڕەزای خوای لە سەر
(د٠خ)
وابوو لــە دوایی ووتیــە پەیغــەمبەر

(د٠خ)
ئەی محمد ئەتــۆ بــە هەژاریــەوە
لە نێو قوڕەیشــیان ئەمنت هێشــتەوە

لەم کاتیشا پەیغەمبەر دورودی خوای لەسەر
ووتیە عەبابــاسی ڕەزای خوای لــە ســەر

چۆن ئەتو ئەبیــە هــەژاری قوڕەیشــیان
ئەی لە کوێێن ئەم ماڵ و پارچــە زێڕەکان

کە تۆ لای دایــکی فــەزلت دانا بــوو
بە خــۆشت ئەتو بــە ئەمت ووتبــوو

ئەگەر ئەمن کوژرام بــە زەنگینیــەوە
هەتا هەتایــە ٠٠٠ ئەتــۆم هێشتــەوە

پێشت ووتبــوو گەر ئــەمن توشبووم
ئەم ماڵــە بــۆ فــەزلو عەبــدوالالاو قەسم

ئیمامی عەباباسیش ڕەزای خــوای لە سەر
(د٠خ)
ئیسلام بوو لــەم کاتا ووتیــە پەیغەمبــەر

(اني أشـــــهد أنـــك رســـول الله)
( وأشـــــــهد أن لا الــــــــه الا الله )

له دوایی‌یا ســوێندی بــه خوا خواردبــوو
ووتی وەالالاهی ئەمـــــه شــــتێ بــوو

له من‌و دایــکی فـــەزل لەم کاتـــا زیاتر
له سەر ئـــەم شتەی کەس نەبــوە حازر

زانینی چــوونی ئیمـــامی عەبابـــاسیش
بۆ جەنگی بـــەدر وەك ووتمـــان ئەویش

لــە موعجیـــزاتی خۆشەویســـتمان بوو
چونــکه جوبرِائیـــل هەمــووی پێ ووتبوو

ئەبو عوززەی جەمحیش(١) له دیلەکان بوو
(د٠خ)
پەیغەمبەری لــە مەکەکە زۆر ئــازار دابوو

وەك دیلیش کـــــرا له جەنـــگی بـــەدر
(د٠خ)
بۆ تکای بـــەردانی چـــوە لای پەیغەمبەر

(د٠خ)
ووتی ئـــەی محمـــد ئـــەمن هـــەژارم
خاوەن پێویســــتی و خـــاوەن منـــاڵم

---

(١) بروانه پەرتوکی نورِوالیەقین/لاپەرە/١٢٤ ٠

له دیلیم بـــــەردە لـــــە چاکی تـــــەوە
(د٠خ)
پەیغەمبەریش بەریدا بــۆ مەکەکە چوەوە

یەکە شاعــیرانی قورەیشـــیان بـــوو
لە دوایی‌شا ئـاوا بەم جـۆرە کوژرابــوو

دیل کرابـــوو لە جەنـــگی حەمرائوالاسد
(د٠خ)
ووتی لەبـــەر کچـــەکانم ئەتــۆ ئـــەی محمد

لە دیلیم بـــەردە پەیمـــانت پێ ئـــەدەم
لەمە دوا جارێ‌تــر من بۆ جەنــگ نەهێــم

(د٠خ)
پەیغەمبـــەریش ووتی وانیـــە وەالالاهی
لە مەکەکە ڕومەتەکانت دەست پێدا نایینی

(د٠خ)
بلێیت محمدم خەڵەتانـــد دوو کــــەرەت
ئیماندار لە کونێ دوو جار پێیوە نادرێت

ئەی زەیـد لـــە ملی ئەبوالعـــوززەی دە
لەم کاتـا زەیـدیش شــیرێکی لــە ملی دا

ئەم جەنــگەی بــەدریش بـۆ مێژوو نامــە
پیرۆزتـــــرینی جەنـــگی ئیســـــلامە

چونکە لەم جەنـــگە خـــوای میهـــرەبان
سەرکەوتنی ئیسلامی دا لەســەر گاوران

هەزاران ســـــلاو لــــە ئیمــــان داران
لە مـــردوو زینـــدو خوالێخۆشـــبووان

هـــەزاران ســـــلاو لە گیانی پــــاکی
شـــەهیدانی ئیسـلام لــە گشت جەنگەکی

بە هــەزارەهاش ســـــلاوی یـــــەزدان
لە شـــەهیدانی جەنـــگی بەدرمــــان

بەتایبەتیش هــەزاران دوعــاو ســلاومان
لە شـــەهیدانی کـــورد و عەرەبمـــان

پەرتوکی بـــــەدریش وەك بەدر ئــــاوا
کۆتایی پێ هــات بە یارمــــەتی خـــوا

لــــە ڕێك کەوتـــووی ڕۆژی شـــەموو
لــە کات ژمێـــری دووی پاش نیـــوەڕۆ

لە یانزەی نۆی هەزارو نۆسەت‌و هەشتاو دوی
لە مێژووی زایینی بـــەرامبەر مێـــژووی

ساڵی کـــۆچی مانـــگی زی القەعـــدەی
بیست‌و سێی هەزارو چوار سەت‌و دووی

بەزۆریش ســوپاس بۆ خــوای میهرەبـان
(د٠خ)
دورودی خواشی لەســەر گەلی پەیغەمبەران

# سەرچاوەکانی جەنگە گەورەکەی بەدری پیرۆز به زمانی عەرەبی

ا ـ تفسير النيسابورى ـ سورة الرحمن ٠

ب ـ تفسير النسفى ـ تاليف العلامة ابى البركات عبدالله بن احمد بن محمود النسفى/١٣١٠ ٠

ج ـ تفسير الخازن ـ تأليف العلامة على بن محمود بن ابراهيم البغدادى الصوفي المعروف بالخازن ١٢٦٩/١٣٤٠ ٠

د ـ تفسير الجلالين ـ تاليف العلامتين جلال‌الدين محمد بن احمد المحلي وجلال‌الدين عبدالرحمن ابى‌بكر السيوطى ٠

هـ ـ تفسير تفريج الغلق في تفسير سورة الفلق ـ تاليف السيد محمد الفوزى السورى ٠

و ـ اتقان التفسير ـ تاليف العلامة جلال‌الدين عبدالرحمن بن ابى بكر السيوطى ٠

ز ـ اسد الغابة في معرفة الصحابة ـ تاليف عزالدين ابن الأثير الجزرى ، ٠ القاهرى ١٤٤٨/١٥١٧ ٠

ط ـ شرح الامام النووى على متن صحيح المسلم ـ تاليف ابو زكريا يحيى بن شرف النووى السورى ٦١٨/٦٦٧ ٠

ح ـ ارشاد السارى في فتوح البخارى ـ تاليف العلامة احمد بن محمد القسطلانى القاهرى ١٤٤٨/١٥١٧ ٠

ى ـ كتاب محمد رسول‌الله (ص) تاليف محمد رضا امين مكتبة جامعة القاهرة سابقا ٠

ك ـ سبل السلام ـ تاليف السيد محمد بن اسماعيل الكحلانى ثم الصنعانى المعروف بالامير ٠

ل ـ نوراليقين في سيرة سيد المرسلين ـ تاليف الشيخ محمد الخضرى بك المفتش بوزارة المعارف ومدرس التاريخ الاسلامى بالجامعة المصرية ٠

م ـ ابجد العلوم ـ تاليف السيد شريف الجرجانى ٠

ن ـ حياة الحيوان ـ تاليف كمال الدين الدميرى القاهرى ١٤٠٥/١٣٤٩ ٠

س ـ نزهة المجالس ـ تاليف الشيخ عبدالرحمن الصفورى السورى ٠

ع ـ المجلة العربى العدد ١٤٦/يناير ، اصدرها الكويت بتاريخ : ١٩٧١ ٠

ف ـ منجد الطلاب ـ تاليف : لويس معلوف اليسوعى اللبنانى ١٩٠٨ ٠

ص ـ قاموس كـوردى ـ عربى ـ النجمـة اللامعـة ـ تاليف فاضـل نظام الدين بمحافظة السليمانية

تـــــمت

# هەڵەو ڕاست

| هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|
| جەنگی بەدزیکرد | جەنگی بەدریکرد | ٧ | ٢ |
| عەربی | عەزبی | ١١ | ١٢ |
| مەغازی | مەعازی | ١٤ | ٢١ |
| گەراو | گەڕاوە | ١٦ | ٣ |
| باسکەن | پاسکەن | ٢٧ | ٧ |
| بۆجەنگ کردن بچۆ | لە بۆ جەنگ بچۆ | ٣٠ | ٦ |
| لە جەنگ ئێمەشین | ئێمەشین لە جەنگ | ٣٢ | ١٨ |
| سەودایش | سەوادیش | ٥١ | ١٠ |
| الدیر | الدبر | ٥٤ | ١٧ |
| لەگرژینا | لە کرژینەوە | ٦٢ | ١ |
| ماق | ماف | ٦٦ | ٨ |
| بگات | بگاتە پەیغەمبەرو | ٧٢ | ١٠ |
| پار | پارە | ٧٤ | ١١ |
| وابوو | وابوو وەك | ٧٦ | ١ |
| عومەر | عومەیر | ٨٣ | ١٧ |
| القاهری ١٠١٧/١٤٤٨ | تەرك | ٩٢ | ١٤ |

ژمارەی سپاردن بە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغداد ٩٨٤/٦٤١

شعر

# معركة بدر الكبرى المقدسة

٦٢٤/يناير

المؤلف
ياسين عبداللطيف محمد نوغراني
امام مسجد ملا عابد بمحافظة أربيل

١٩٨٤م - ١٤٠٤هـ

الطبعة الاولى

نرخى يەك دينارە